- کتێب: فەلسەفەی ئاکاری پزیشکی و مافەکانی نەخۆش
- نووسەر: ڕێبوار سیوەیلی
- نەخشەسازیی ناوەوە و بەرگ: زاری
- بابەت: لێکۆڵینەوە
- چاپ: دووەم٢٠٢٠
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نرخ: ٥٠٠٠هەزار دینار
- لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی پەرتووکخانەگشتییەکان ژمارە (٢٧٢)ـی ساڵی ٢٠٢٠ـی دراوەتێ.



**لە بڵاوکراوەکانی سەندیکای پزیشکانی کوردستان و ڕێکخراوی زەریاب بۆ خزمەتگوزاری کولتووری**





**پێشکەش بێت بە:**

**مەلامحەمەدی ئیرواسی دەڤەری وان، (کۆتایی سەدەی هەژدەیەم و سەرەتای سەدەی نۆزدە)، کە یەکەم دەستنووسی پزیشکی و نۆژداریی بە زمانی شیرینی کوردیی بۆ بەجێهێشتووین.**

# پێشەکیی و پێزانین

نوسینی توێژینەوەیەک لە بارەی فەلسەفەی ئاکاری پزیشکی و مافەکانی نەخۆش، کارێکی تاکەکەسیی نییە و کارێکی ئاسانیش نییە. لەگەڵ ئەوەشدا کە چەند ساڵێکە ئەم بابەتە سەرنجم ڕادەکێشێت و چەند وتارێکیشم لەوبارەیەوە نوسیوە[1] ئەم بەرهەمە ئەنجامی ئەم هەوڵدانمە بۆ بەشداریکردنم لە کۆنفرانسی فەلسەفیی (*بیت الحکمە*)ی عێراقی لە شاری دهۆک، لە (٦-٧/١٠/٢٠١٢)، کۆی پێشنیازەکانی ئەم توێژینەوەیە لەلایەن کۆنفرانسەکەوە پەسەند و پشتگیریی کران. کە ئەوە بۆ من جێی شانازیی بوو.

چاپی یەکەمی ئەم کتێبە وەزارەتی تەندروستیی حکومەتی هەرێمی کوردستان لەسەر ئەرکی خۆی بڵاوی کردەوە، ئەم چاپەی ئێستا بە پشتگیری **سەرۆکایەتی سەندیکای پزیشکانی هەریمی کوردستان** بڵاو دەبێتەوە. ئەمەش هەستێکی خۆشم دەداتێ کە لایەنی بەرپرس و پسپۆڕی بوارەکە خۆیان دەکەنە خاوەنماڵ. خۆزگە دەخوازم کارەکەم لە بواری پرۆفیشناڵیی و پێگەیاندنی پزیشک و هەروەها لە بواری پراکتیکیی ڕۆژانەشدا

---

[1] ریبوار سیوەیلی: نەتەوەو حەکایەت، بەرگی یەکەم، چ: دووەم، دەزگای موکریانی، وتاری: (**چارەسەرکردن لە نێوان پسپۆڕیی و میهرەبانیدا**)، ل: ٢٧٩-٢٩٥، ٢٠٠٨.، کە وەک بەڵگەنامەیەک لە کۆتایی ئەم کتێبەدا بڵاو کراوەتەوە.

ڕەنگدانەوەی هەبێت. هیواداریشم ئەم هووشیارییەی ئەم بابەتە دەیگرێتە خۆی لە سیاسەت و بەرنامەکانی حکومەتیشدا ڕەنگدانەوەیان هەبێت و بە تەرخانکردنی بودجەی پێویست، بەیاساییکردنی بوارەکە و هەلڕەخساندن بۆ پزیشک و کاگوزارانی کەرتی تەندروستی و باشکردنی باری ژیانیان و کەمکردنەوەی ئەرکی ناچارەکییان، قەرەبوو بکرێتەوە. ئەمەش لەبەر ئەوەی هاندەرێک دروستبکەین تا پزیشک و هاوکارەکانیان شانبەشانیی ئەرکە پیشەیی و زانستی و هونەرییەکەیان، ئەرکێکی نیشتمانیش جێبەجێبکەن، چونکە بەشداریی ئەوان لە نەتەوەسازیدا گرنگیی تایبەت بەخۆی هەیە.

هیوایەکیی ترم ئەوەیە، کە ئەم بەرهەمە بەشداریی بکات لە دانانی پرۆگرام بۆ وانەی **ئاکاری پزیشکی**. پێویستیشە ئەم وانەیە لە ماوەی چەندساڵێکدا و لە هەموو بەشەکانی بواری خوێندنی پزیشکیی و تەندروستیی و پەرستاریی بخوێندرێت و مامۆستای پسپۆڕ وانەکە بڵێنەوە.

باسەکەم بە جۆرێکی وا نووسیوە کە شیاوی تێگەیشتن بۆ پزیشک و چارەساز و نەخۆشەکانیش بێت، هەم بۆ ئەوەی تێگەیشتنێکی هاوبەش لە نێوانیاندا بێتە کایەوە و هەم بۆ ئەوەش کە ئەم بابەتە ببێتە مایەی گفتوگۆ.

سوپاسی گشت ئەو کەسانە دەکەم کە هاوکار و پشتگیرم بوون، بەتایبەتی بەڕێز دکتۆر باساک بەرزنجی، سەرۆکی سەندیکای پزیشکانی هەرێمی کوردستان، کە کتێبەکەی خوێندوە و بە تێبینییەکانی دەوڵەمەندی کرد.

## ڕوانگەی لێکۆڵینەوە (میتۆد):

ئەم بەرهەمە بچکۆلەیە لەسەر ئەو بڕوایەوە دامەزراوە، کە پێماندەڵێت: ئاکارناسیی پزیشکی شتێک نییە لە ***دوای*** پیشەی پزیشکییەوە، یان لە ***دەرەوەی*** مێژووی ئەم پیشەیەوە سەری هەڵدابێت. بەڵکو بەڵگە مێژووییە باوەڕپێکراوەکان ئەوە دەسەلمێنن، کە ئاکاری پزیشکیی و مافەکانی نەخۆش، بەشێکی جیا نەکراوەن لە (***پیشە و زانست و هونەر***)ی پزیشکی لە پرۆسەی گەشەکردنی ئەم زانستەدا تا گەیشتووە بە ئاستە مۆدێرنە ئەمڕۆییەکەی. ئەمەش هانمان دەدات بەدوای پێشینەی ئەم بەڵگانەدا بگەڕێین و هۆکارەکانی بخەینە ڕوو. من لەم کتێبەدا داکۆکیی لەو بڕوایە دەکەم کە ***پزیشکیی وەک پیشەیەک هەم هونەر و هەم زانستە و ئەم هونەر و زانست و پیشەیەش بەرهەمهێنەری ئاکارێکی تایبەتە، کە ناکرێ لێکتر جودا بکرێنەوە.***

بۆیە میتۆدی ئەم باسە بریتیە لە گەڕان و پشکنین بەدوای پەیوەندیی نێوان پیشە و زانستی پزیشکیی و سەرچاوە فەلسەفییەکانیدا، بەو مەبەستەی پەیوەندیی نیوانیان بدۆزینەوە و گرنگیی ئەو پەیوەندییە بۆ ئێستاش ئاشکرا بکەین، بەتایبەتی ئەوەی کە پەیوەستە بە ئاکاری پزیشکیی و نەخۆشناسیی و مافەکانییەوە.

ئەم میتۆدە یارمەتیمان دەدات تێزێک بخەینە ڕوو بۆ ئەوەی لە ڕێگایەوە بیسەلمێنین، پیشەی پزیشکی بەهۆی پەیوەندییە جەوهەریی و مێژووییەکەیەوە بە فەلسەفەوە، لە هەمان کاتیشدا وەک هونەر و زانستێک کە سەروکاری لەگەڵ مرۆڤ هەیە، ئاواش هەڵگری ئاکاری تایبەت بەخۆیەتی. بۆیە کاری پزیشکی هەرگیز لە بنەما زانستیی و هونەریی و پیشەییەکەی خۆیدا لە ئاکاری تایبەت بەخۆی دابڕاو نەبووە. سەلماندنی ئەم تێزە یارمەتییەکی باشمان دەدات بۆ سەرلەنوێ بیرکردنەوە لە پەیوەندیی نێوان فەلسەفە و زانست و بەتایبەتیش گرنگیی (ئاکاریی پیشەیی و زانستیی) لە بوارێکی مرۆیی و خزمەتگوزاریانەی وەک پیشەی پزیشکیدا.

لە پێش یۆنانییەکانیشەوە، لە شارستانییەتەکانی دیکەی جیهانی کۆندا، وەک چین و هیند و بابل و ناوچەجیاوازەکانی کوردستانیشدا، پیشەی پزیشکی هەبووە، بەڵام زانستی پزیشکی لە یۆنانی کۆندا بە سەرەتاگەیەکی ژیرانەی ئەم پیشەیە دادەنرێت و پزیشکە یۆنانییەکان یەکەمین هەنگاوەکانیان بە ئاراستەی بە زانستیکردنی پیشەی پزیشکیدا هەڵهێنان. هەرچەندە پێشینەی پیشەی پزیشکی لە یۆنانی کۆنیشدا، بنەمایەکی ئەفسانەیی و ئاییني هەیە، بەڵام نکوڵی لەو ڕاستیە ناکرێت کە پێماندەڵێت: هونەر و زانستی پزیشکیی لەو وڵاتەدا، لە ئامێزی فەلسەفەدا سەریهەڵدا (لیندبرگ: ١٩٩٨، ص: ١٥٣). لەوەش زیاتر دەکرێ بگوترێ پزیشکیی لە قۆناغی یۆنانیی کۆندا لە زۆر ڕووەوە هاوشێوەی پزیشکیی لە سەردەمی نوێدابوو، کە لە ڕێنیسانس بەدواوە دەست پێدەکات (محسنی: ٢٠٠٣، ل: ٢٢٠).

ئەم ئاراستەیەی پزیشکی جگە لەوەی شێوەی هەڵسوکەوتی لەگەڵ نەخۆشیدا ئەقڵانیی و ئەزموونگەرا بوو، ئاواش پەیوەست بوو بە فەلسەفە و بیروڕاکانی ئەو سەردەمەوە، ئەمە جگە لەوەی پەیوەندیی پزیشک و نەخۆش لە دۆخێکی لۆژیکیانەدا بوو، ئاواش تا دەهات تێڕوانین لە سەر نەخۆشی دەچووە چوارچێوەیەکی (مرۆییەوە)و نەخۆشیی بە (بەڵای ئاسمانی)، یان (نەفرەت) و لەعنەتیی هێزەباڵاکان لە مرۆڤ، تەماشای نەدەکرا.

بەمجۆرەش پزیشکیی تا دەهات خۆی لە دیدگای خورافیانە ڕزگار دەکرد و ڕەهەندە فەلسەفیی و ژێرباوەڕییەکانی بەهێز دەبوون. لێرەشەوە، ئەزموون و دۆزینەوەکان، پێشکەوتنی بەردەوام و تێبینیکردنە گشتگیرەکان دەچنە بری بیروڕای خورافیانە و ناژیرانە و میتافیزیکیانەوە (محسنی: ٢٠٠٣، ل: ٢١٢)

هیپۆکراتیس (٤٧٠-٣٦٠پ. ز)، کە لە جیهانی مسوڵماننشیندا بە (بقراط، یان أبوقراط) ناسراوە، ڕۆڵ و کاریگەرییەکی مەزنی هەبووە لە گواستنەوەی پیشەی پزیشکی نەریتی بۆ ئاستی زانست و پیشەیەکی هونەری بەو مانایەی ئەمڕۆ ئێمە لەو زانستە تێدەگەین. ئەم پزیشکە فەیلەسووفە، پەیڕەوکاری (پیتاگۆراس)ی فەیلەسووف بووە و یەکەم پزیشکە بەو مانایەی پیشەکە بە شێوە زانستیەکەی هەڵگریەتی، ئەمەش جیای دەکاتەوە لە شێوازەکانی چارەسەری پێشزانستیانە، وەک شێوازیی جادوو و دۆعا و قوربانیدان و هتد.

پیتاگۆراس بۆخۆی جگە لە بیروڕاکانی لە بواری ماتماتیک، مۆزیک و ئەستێرەناسیدا، خاوەن قوتابخانەیەکی فەلسەفیی

ڕۆحیی تایبەت بەخۆیشی بووە و تیایدا پەیڕەوکارەکانی لەسەر کۆمەڵێ بنەمای ئاکاریی و تەندروستیی ڕادەهاتن، کە گیاخۆریی یەکێک بووە لەو مەرجانەی دەبوو ئەندامانی فێرگەی پیتاگۆراسی پەیڕەویی لێبکەن و پێوەی پابەندبن (سیوەیلی: ٢٠١٢، ل: ٩١-٩٣).

ئێمە دەمانەوێت بە قسەکردن لەسەر پەیوەندیی نێوان ئاکارناسیی بەگشتیی و ئاکاری پزیشکیی و لە پەیوەندیی بە بنەما فەلسەفییەکانی خۆیەوە، هەم سەرنج بۆ کارایی هزری فەلسەفی و هەم پەیوەندیی ئەم لقە و پزیشکی ڕابکێشین و لایەنەکان هان بدەین بۆ ئەوەی گرنگیی فەلسەفە لە بوار و پیشە و زانستەکانیتردا لەبیر نەکەن. ئەمە جگە لەوەی لەم ڕێگایەوە فەلسەفەش دەخرێتە بەردەم ئەرکی نوێ و پراکتیکیی ئەوتۆ، بەجۆرێ کە ئامادەییەکی ئاشکرای لە ناو کایە زانستیەکانیتر و کۆمەڵگەدا هەبێت. پێویستیشە فەلسەفە لە کۆمەڵگەی ئێمەدا جگە لە ئەرکە پرۆفێشناڵییەکەی خۆی، کە ناساندن و دامەزراندنی نەریتە فەلسەفیەکانی جیهانە لە ناو ئیمکانیەتەکانی زمانی کوردیدا، بشتوانێ بەم زمانە دێرینە بیر بکاتەوە و کێشەکانی ناو جیهانی کوردستانیی بباتە ئاستی فەلسەفیی و بەشێوەیەکی میتۆدیک چارەسەریان بۆ بدۆزێتەوە، یان بەشداریی بکات لە چارەسەرکردنیاندا. ئێمە لەم نییەتەوە هەستاوین بەم ئەرکە پیرۆزە تا هەم خزمەتێکمان بە پزیشک و نەخۆشەکان و هەم بوارێکیشمان دەستنیشان کردبێ، کە تیایدا چاوەڕێدەکرێت، بیرکردنەوەی فەلسەفیی کارایی خۆی بسەلمێنێ.

## گرنگیی ئەم باسە:

ئەگەر ئەو گریمانەیە ڕاست بێت، کە پزیشکیی و فەلسەفە هەر لە بنەماوە لە پەیوەندیدا بوون و خزمەتیان بە یەکتر کردووە، ئەوە دۆزینەوە و نوێکردنەوەی ئەو پەیوەندیە لە ئێستادا کارێکی یەکجار گرنگ و پێویستە. هەم بۆ فەلسەفە و ڕۆڵ و کاریگەریی پێشڕەوانەی لە ژیانی مرۆییماندا و هەم بۆ ئەو بەشدارییە چارەنووسسازانەی لە بواری پیشەی پزیشکیدا پێشکەشی کردوون.

لەلایەکیتریشەوە، ئەم جۆرە باسانە بۆ پزیشکییش گرنگییەکی بێنمونەیان هەیە، چونکە جیهانبینیی ئەم زانست و پیشەیە کە لەسەر تێگەیشتن لە مرۆڤ بەندە، تازە دەکاتەوە، بەتایبەتی لە سەردەم و زەمانەیەکدا کە مرۆڤ وەک هەر کاڵایەکی تر تەماشای دەکرێت. کاتێک بیر لە قەیرانەکانی پزیشکی و چارەسازیش لە وڵاتەکەماندا دەکەینەوە و سەرنجی ئەو دابڕانە مەعریفییەی نێوان پیشە و زانستی پزیشکیی و بنەما ئاکاریی و فەلسەفییەکانی لە بواری پراکتیکیدا دەدەین، ڕوونتر گرنگیی ئەم جۆرە باسانەمان بۆ دەردەکەوێ.

ئەم باسە گرنگییەکی تایبەتیشی هەیە بۆ نەخۆشەکان و بردنەسەری ئاستی هووشیاریان لەبارەی نەخۆشیی و مافەکانیانەوە. ئەو نەخۆشانەی ئاگاداری ماف و ئەرکەکانیانن، کاریگەرییەکی زۆریان هەیە لەسەر ڕەوەندی چارەسەرکردن، بەدەستهێنانی دەستکەوتی زیاتر بە ئاراستەی چاودێریی پزیشکی و خستنەڕووی پێشنیاز بۆ کەمکردنەوە و بنکەندکردنی کەموکوڕیی و کێشەکان (الفتریو: ٢٠٠٧، ل: ١٨)

بۆیە ئەم باسە دەخوازێ بەشدارییەکی کەم و کاریگەربەخش لەو زەمینەیەدا بێت و خزمەت بە گێڕانەوەی ئەو پەیوەندیە گرنگەی نێوان بیری فەلسەفە و زانستی پزیشکیی بکات.
ئەمە جگە لەوەی دەمانەوێت لە ڕێگەی ئەم باسانەوە، ***سەرنجی زانکۆکان و بەشە پزیشکییەکان بۆ گرنگیی وانەی (ئاکاریی پزیشکی) رابکێشین، تاکو لە پێکەیاندنی قوتابیە پزیشکەکاندا لە پێشچاوی بگرن و وەک وانەیەکی زێدە گرنگ بۆ بیناکردنەوەی ڕۆحیی مرۆییانەی پزیشکەکانی دوارۆژ تەماشای بکەن.*** چونکە ئەم هەنگاوە ڕێگریی زۆرێک لەو کەموکوڕیانە دەکات کە بۆیان هەیە لە ئەنجامی دابڕانیی پزیشک لە ئاکاریی پیشەیی و لە میانەی کاری پراکتیکیدا، ڕوو بدەن و هەڵەی چارەسازییان لێبکەوێتەوە.
هیوادارم بەم باسەمان خزمەتێکمان بە زانستیی پزیشکی و ئەو ڕۆڵە مرۆییەی کردبێت، کە بۆ بیناکردنی ئاسوودەیی مرۆیی لە جیهان و وڵاتەکەماندا پێویستە. بێگومان دەشمانەوێت پشتگیریی هەرجۆرە سیاسەت و گۆڕانکارییەکیش بکەین کە لە ئاستی سیستەمی سیاسی و تەندروستیدا بە ئاراستەی مرۆییکردنەوەی پیشەکەدا بیردەکاتەوە و کار دەکات. ئێمە ئەمە بە ئەرکێکی مرۆیی و نیشتمانیی دەزانین و ڕەهەندیی ئاکاریانەی توێژینەوەکەمان پشتڕاستدەکاتەوە.

# پێناسەی شیکاریانەی زاراوەکان

## ئاکاری پزیشکی:

پەیوەندیی پزیشک و نەخۆش، پەیوەندییەکی ئاکاریانەیە و ئەمەش لەو ساتەوەختەوە بە شێوەیەکی کردەیی دەستپێدەکات، کە پزیشک مەچەکی نەخۆش دەگرێت بۆ ئەوەی لێدانی دڵی پێوانە بکات، تا دەگاتە ئەو کاتەی کە پزیشک بیر لە کۆتایهێنان بە ژیانی نەخۆش دەکاتەوە بە شێوەیەکی یاسایی و دوای گرتنەبەری هەموو ڕێوشوێنە تایبەتیەکان و ڕەزامەندییەکان.. هیچ پەیوەندییەکی پزیشک و نەخۆش لەدەرەوەی پەیوەندییەکی ئاکاریانەوە نییە و ئەمەش هەم کردە کۆنکریتیەکانی وەک نەشتەرگەریی و هەم ڕەفتارە سیمبوولییەکانی پزیشک، وەک سڵاوکردن لە نەخۆش، دەگرێتەوە.

ئاکار (Ethic) لقێکی فەلسەفە و زانستێکە بۆ ئاراستەکردنی ڕەفتاری مرۆیی بەهەموو شێوەکانییەوە (لالاند: ٢٠٠٨، ل: ٣٧٠). ئەم لقە زانستییە لە بواری پزیشکیدا بە ئاکاری پزیشکی ناو دەبرێت و ئەمەش قەڵەمڕەوێکە لە سنووری نێوان هەردوو پانتایی پزیشکی و فەلسەفەدا. واتە ئاکاری پزیشکی تخووبی

پێکەوەبەستنەوەی هەردوو پانتایی پزیشکیی و فەلسەفە تێکەڵ دەکات و پێکیانەوە دەبەستێتەوە، ئەمەش بەجۆرێ کە هاوکاریی نزیکانەی نێوان پزیشک و فەیلەسووفەکان لەم بوارەدا ئەنجامیی بەسوودیی لێبکەوێتەوە.
هەر لەبەر ئەو ڕاستییەشە، کە توێژەرانی ئەم بوارە، لەسەر ئەو بڕوایەن ئاکاری پزیشکی هەم لقە زانستێکی پزیشکیی و هەم لقەزانستێکی فەلسەفییشە. لقێکی پزیشکیە، چونکە کێشەکانی چ لە ڕووی تیۆریی و چ لەڕووی کردەییەوە پەیوەستن بە زانستیی پزیشکییەوە. لە هەمان کاتیشدا لقێکی فەلسەفەیە چونکە نزیکەی کۆی ئەو کێشانەی لەوێدا دێنە پێش هەر هەمان ئەو کێشە ئەخلاقیانەن کە فەیلەسووفەکان بە درێژایی چەندین سەدە پێیانەوە سەرقاڵ بوون و مشتومڕیان لەبارەوە کردوون (هنریک ر. ولف: ٢٠٠١، ٢٢٧).
بۆیە دەتوانرێ بگوترێ ئاکاری پزیشکی بریتیە لەو زنجیرە ڕێنماییە فەلسەفیی و ئاکاریانەی کە ئاراستەی هونەر و پیشە و زانستی پزیشکیی لە ڕووی تیۆری و کردەییەوە دەکات و ئەم زانست و هونەر و پیشەیە لەلای خەڵکیی ئاسایی و نەخۆشەکان خۆشەویست دەکات، ئەویش بەجۆرێ کە ڕێزی لێبگرن و متمانەی پێبکەن.
ئەوە ئاکاری پزیشکییە، مانا بە پیشەکە دەدات، زانستیبوونەکەی دەسەلمێنێت و هونەرەکەیشی بەرز دەکاتەوە بۆ ئاستی بڕواپێبوون و متمانەبەخشین.
ئاکاری پزیشکی جگە لە پێشینە مێژووییەکەی لە پەیوەندیی بە فەیلەسووفە پزیشک و پزیشکە حەکیمەکانەوە، کە ئێمە لەم باسەدا (هیپۆکراتیس)مان کردووە بە نمونە، بۆ یەکەمجار لە

ساڵی ١٩٤٧ و پاش دادگایکردنی ئەو پزیشکانەی لە دەسەڵاتی نازیزمدا بنەماکانی پیشەکەی خۆیان لە پێناوی ئایدیۆلۆژیا و ڕەگەزپەرستیدا، پشتگوێ خستبوون، لە ئاستی نێونەتەوەییدا لە بەیاننامەیەکدا باسیکراوە. تاوانی ئەم پزیشکانە ئەوە بوو کە دیلەکانی جەنگ و زیندانییەکان و جووەکانیان ڕووبەڕووی سزاگەلێکی نامرۆڤانە کردبۆوە و ڕەوایەتیی زانستییان بە بۆچوونی ئایدیۆلۆژیای نازییەکان دابوو، کە لەو بڕوایەدا بوون جوو، قەرەج، هۆمۆکان و ئەوانیتری غەیرە ئاریایی، مرۆگەلێکی کەم و نابووتن و پێویستە لەناو ببرێن. ئەوانە بە حسابی خۆیان سەلماندبوویان کە مێشکی هەر جوویەک لە مێشکی ئارییاییەکان بچووکترەوە و ئەمەشیان وەک بەڵگەیەک دەخستە ڕوو بۆ ڕەوایەتیدان بە قەڵاچۆکردنیان..

دووەمین بەیاننامەی فەرمی سەبارەت بە ئاکاریی پزیشکی لە نوسراوەی ناسراو بە (هیلسنکی) لە ساڵی ١٩٨١دا هاتووە (آندرولاالفتریو؛ ٢٠٠٧).

شتێک هەیە پێویستە بۆ پزیشکە بەڕێزەکان و خوێنەری ئەم بابەتە ڕوونبکرێتەوە، ئەویش ئەم ڕاستیەیە: ئەوەی ئێمە لەم توێژینەوەیەدا پێیدەڵێین ***ئاکاری پزیشکی***، هەمیشە لە گۆڕاندایە و بەردەوام زیادەی دەخرێتە سەر و مەودای کارایی و ناکاراییەکەی لێی زیاد و کەم دەکرێتەوە. بۆ نمونە هەمیشە ئاکاری پزیشکی و مافەکانی نەخۆش، باسێکی تری لە پشتەوەیە کە ڕێنمایی بۆ نەخۆش و دەستنیشانکردنی ئەرکەکانی و مافەکانی پزیشکن. ئەمە جگە لەوەی بنەماکانیی ئاکاری پزیشکی بەهۆی شیکردنەوە فەلسەفییەکان و ئەو داتا و تۆمارانەی پزیشکەکان لە ئەنجامیی پراکتیکیی کاری

ڕۆژانەیانەوە لەگەڵ مرۆیە نەخۆشەکان کۆیان دەکەنەوە، گۆڕانیی بەسەردا دەهێنرێت و دانایی فەلسەفیی و پزیشکی لەمەشدا هاوکاریی یەکتر دەکەن.
لەلایەکیترەوە، ئەوەی ئێمە پێیدەڵێین ئاکاری پزیشکی، هەر بە تەنیا پەیوەندیی نێوان دکتۆر و نەخۆش، نەخۆشخانە و نەخۆش و پەیوەندیی نێوان کارگوزارانی سیستەمی تەندروستی و نەخۆشەکان، ناگرێتەوە. ئەوە ئەرکی سیاسەت و ئاکاریی پزیشکیە کە ***خزمەتگوزاریە تەندروستییەکان و ئاستیی کولتووریی خەڵک لەبەرچاو بگرێت و لە هەمان کاتیشدا چاوپۆشیی نەکات لە بارودۆخی زانستە پزیشکییەکان و ئیمکانیەتە تەکنەلۆژییە پێویستەکان***(هنریک ر. ولف: ٢٠٠١، ٢٣٢).

بەمجۆرەش، ئاکاری پزیشکی لقێکی فراوانیی ڕەفتار، زانیاریی و ڕۆشنبیرکردنە لە بواری پزیشکیدا، کە لە لایەکەوە دەروەستیی ئاکاریانەی خۆی لە ئاست کۆمەڵگە و هاووڵاتیاندا دەسەلمێنێت و لەلایەکیتریشەوە ئەرکی نوێکردنەوەی زانستیی و تەکنەلۆژیی بواری تەندروستیی دەگرێتە ئەستۆی خۆی. بۆیە بەشێوەیەکی گشتیی:

**(مەبەستمان لە ئاکاری پزیشکی ئەو سیاسەتانەی تەندروستییش لە وڵاتێکدا دەگرێتەوە، کە سیستەمی سیاسی لە ڕێگەیانەوە بەرگریی لە بارودۆخی تەندروستیی و خاوێنیی و ساخلەمیی کۆمەڵگە دەکات و بەهۆیانەوە ئاساییشی کۆمەڵایەتی دابین دەکات.** (محسنی: ٢٠٠٣، ل: ٢٤٥).

ئەمەش بەمانای ئەوەیە کە ئاکاریی پزیشکی، ئاشکراکەری ئاکاری ئەو سیستەمە سیاسی و تەندروستیەیە کە سەپەرشتیاریی و سەروەسیتیی بەسەر بواری تەندروستییەوە لە ولاتدا دەکات. بەهۆی ئەو پشتگیریی و پشت تێکردنەی لایەنی سیاسی لە ئاکاریی پزیشکیی دەیکات و ئەم پیشەیەی پێ بەهێز و لاواز دەبێت، تێدەگەین کە سیستەمی سیاسی چۆن لە مرۆڤی کۆمەڵگەی خۆی دەنوڕێ و چۆنیش سیستەمە خزمەتگوزاریی و فریاگوزارییەکانی خۆی ئاراستە دەکات بۆ جێبەجیکردن و هێنانەدیی بۆچوونەکانی. یەکێک لەو سیستەمانەش و بگرە گرنگترینیشیان بریتیە لە سیستەمی تەندروستیی و یەکە پێکهێنەرەکانی و کارگوزارانیی، کە بێگومان پزیشکەکان لە پیش هەموویانەوەن.

بەمانایەک لە ماناکان، پزیشکەکان بەرجەستەکەری نەک هەر ویژدانی تایبەتیی خۆیانن، بەڵکو بەرجەستەکەری ویژدانی گشتیی و عەدالەتیشن، چونکە ئەوان لە ڕێگەی پیشەکەیانەوە نوێنەرایەتی دادوەرانە و ویژدانیی گشتیی دەکەن. ئەوان نەک لەبەر ئەوەی بەزەییان بە هاولاتیانی نەخۆشدا دێتەوە، نەک لەبەر ئەوەی خۆیان و کەسوکاریان نەخۆشدەکەون، بەڵکو لەبەر ئەوەی پیشەکەیان بەجۆرێکە هەم لە ڕووی زانستیی و هەم لەڕووی هونەرییەوە، ئەرکی ئەخلاقییان دەخاتە ئەستۆو بەمجۆرەش نوێنەرایەتی ویژدانی گشتیی و عەدالەت دەکەن.

## بنەمای فەلسەفیانەی ئاکاری پزیشکی:

مەبەستمان لە بنەمای فەلسەفیی ئاکاری پزیشکی، ئەو بناخە و تێگەیشتنانەیە کە فەیلەسووفەکان بۆ چۆنێتی شێوازیی مامەڵەکردن لەگەڵ مرۆڤ و نەخۆش، دایانڕشتوون و بەڵگەی پێویستیان بۆ هێناونەتەوە تا ڕەوایەتی پەیڕەوکردنیان بسەلمێنن. هەرچەندە بۆی هەیە هەموو ئەو بنەما و پێشنووسانەی فەیلەسووفەکان بۆ چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ دۆخیی (نەخۆشیی) مرۆڤدا نەبن، بەڵام بەو هۆیەوە کە فەیلەسووفەکان دۆخیی مرۆڤبوونیان بە (جەوهەرێکی نەگۆڕ) داناوە، ئەوە دەکرێ هەمان ئەو بنەمایانەی بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ مرۆڤ پێویستن، بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ نەخۆشیش پێویست بن، **چونکە *مرۆڤ بەوەی کە نەخۆش بکەوێت، جەوهەری مرۆڤبوونی خۆی لەدەست نادات.***

بنەمای فەلسەفەی ئاکاری پزیشکی لە ڕووی فەلسەفیی ڕووتەوە، لە بڕیارنامە و بەیاننامە پزیشکیەکان کۆنترە و ڕەگوڕیشەیەکی دێرینەتری هەیە، چونکە وەکئەوەی ئێمە لە ئەنجامی خوێندنەوەی سەرچاوەکانەوە بۆمان دەرکەوتووە و لێی تێدەگەین، ئەم ئاراستەیە لە کارەکانی فەیلەسووفی ئەڵمانی: ئیمانۆیل کانت (١٧٢٤-١٨٠٤)دا بنەوانەکانی خۆی دەدۆزێتەوە.

کانت لەو بڕوایەدایە مرۆڤ لە ناو هەبووەکانیتر و زیندەوەرەکاندا پێگەیەکی تایبەت بە خۆی هەیە، چونکە مرۆڤ خاوەنی بەهایەکی جەوهەرییە لە خۆیدا، کە ئەویش بریتیە لە ***کەرامەتی مرۆیی***. ئەمەش وادەکات ئێمە هەرگیز نەتوانین وەک ئامرازێک بۆ گەیشتن بە مەبەستێک سوود لە بوونی مرۆیی

وەربگرین و لە میانەی هیچ پیشە و کردارێکدا وەک هۆکارێک بۆ گەیشتن بە مەبەستێکی تایبەت، مامەڵەی لەگەڵ بکەین.

کانت لە کتێبی (***بونیادی میتافیزکای ئاکار، ١٧٨٥***)دا نووسیویەتی:

> **(تەنیا بە پێی ئەو یاسایە هەڵوێست وەربگرە، کە هاوکات توانای ئەوەت بداتێ یاساکە، ببێتە یاسایەکی جیهانگرەوە) (ریچلز: ٢٠١٠، ل: ١٩٤).**

لێرەشەوە کانت دوا پرانسیپی ئاکار وەک بنەمایەکی نەگۆڕ و ڕەها، بەمجۆرە داڕشتووە:

> ***(بەوجۆرە ڕەفتار بکە، کە مەردەم مرۆڤایەتی، چ لە خۆتاندا و چ لە کەسانیتریشدا، وەک ئامانج ببینی، نەک تەنیا وەک ئامراز) (هەمان س. ل: ١٩٤)***

بەپێی تێگەیشتنی ئەم فەیلەسووفە لە ئاکار، لە هیچ بارودۆخێکدا مرۆڤە لە خۆیدا، ئامراز نییە و هەمیشە و بۆ بێکۆتا لە کات و شوێندا و بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەو بارودۆخەی تێیدایە، وەک ئامانج دەمێنێتەوە، چونکە مرۆڤ خاوەنی کەرامەت و گەورەیی سرووشتیانە و جەوهەریانەی خۆیەتی. ئەمەش ئەوەمان پێدەڵێت، کەرامەتی مرۆیی لە سەرووی هەموو شتێکی ترەوەیە و هەر ئەمەشە ڕێدەگرێ لەوەی مرۆڤ بکرێتە ئامراز لە پێناوی ئامانجێکدا کە لەدەرەوەی خودی خۆیەتی. بەم پێیەش، کەرامەت لە مرۆڤدا شیاوی کەمکردنەوە و دەستکارییکردن و هێنانەخوارەوە نییە. (ریچلز: ٢٠٠٠، ل: ١٩٣-١٩٨).

بۆیه هەر ڕەفتارێک لەگەڵ مرۆڤ، لە هەر کات و شوێنێک و هەر بارودۆخێکدا، کە مرۆڤ بە ویستی خۆی، یان لەدەرەوەی ویستی خۆی، تێیدەکەوێت، لەوانەش دۆخی نەخۆشیی و بێهۆشیی، بە پێچەوانەی ئەم پرانسیپەوە بێت، بە ڕەفتارێکی ئاکارمەندانە داناندرێت و سەرزەنشت و لۆمە و سزای بەدواوەیە. مەبەستی کانت لە ئاستە کردەکیەکەیدا ئەوەیە، ***پێویستە مرۆڤ هەمیشە بەو جۆرە هەڵسوکەوت لەگەڵ مرۆڤەکانیتردا بکات، کە خۆی حەز دەکات هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکرێت***. چونکە هەر ئەوەی کە مرۆڤ بە هەندێ ڕەفتار و هەڵسوکەوت چارس دەبێت و نیگەرانیی دەیگرێت و هەستدەکات غەدری لێکراوە، یان تێگەیشتن لەخۆی خراوەتە ژێر پرسیارەوە، گاڵتەی پێکراوە، بەچاوی نزم تەمشای کراوە، بێموبالاتیی لە ئاستدا پیشاندراوە، ئەوە بە مانای ئەوەیە کەرامەتی مرۆیی بریندار بووە. ***بۆیە پێویستە ڕەفتارەکانمان لە ڕوانگەی ڕێزگرتنمان لە کەرامەتیی تایبەتیی مرۆییمانەوە دابڕێژین بۆ ئەوەی وەک یاسایەکی گشتگرەوەیان لێبێت، تا هەموان بەو جۆرە لەگەڵ یەکتر ڕەفتار بکەن، کە خۆیان چاوەڕێ دەکەن ڕەفتاریان لەگەڵ بکرێت.***

بەپێی ئەم بنەمایە بێت، پیشە و زانست و هونەری پزیشکی ئەرکێکی ئاکاریانە دەخاتە ئەستۆی پزیشک و گشت کارگوزارانی بواری سیستەمی تەندروستییەوە لەبەرامبەر نەخۆشدا بەو پێیەی کە هەمیشە لە نەخۆشدا، مرۆڤێک، یان تاکەکەسێکی خاوەن کەرامەت ئامادەیە.

هەر لێرەشەوە، ئەم مەرجە کانتییە، پەڕیوەتەوە بۆ ناو جاڕنامەی گەردوونیی مافەکانی مرۆڤ و دەوڵەت و کۆی

کۆمەڵگە و سیستەمەکانی بەرپرسیار و دەروەستکراون لە ئاست ڕێزگرتنیان و پەیڕەوکردنیان (بیئاتە. شلیدال: ٢٠١١، ل: ٢٥-٢٨).

هەر کەس ئەو جاڕنامەیە بە وردیی بخوێنێتەوە، ڕەنگدانەوەی تێگەیشتن و ئاکارناسیی کانتیانەی تێدا دەبینێتەوە. لە پەرەگرافی (٢٥)ی ئەو بەیاننامەیەدا هاتووە:

(***هەر مرۆڤێک شایانی ژیانێکی ستاندارد و شیاوە بۆ دابینکردنی سەلامەتیی و خۆشگوزەرانیی خۆی و خێزانەکەی، وەک دابینکردنی خۆراک، پۆشاک، ماڵ، چاودێریی پزیشکیی و خزمەتگوزاریی کۆمەڵایەتی و هەروەها مافی ئەوەی هەیە لەکاتی بێکاربوون، نەخۆشی، کەمئەندامی، مردنی هاوسەر، بەساڵاچوون و نەبوونی سەرچاوەکانی دەرامەت، لە ژێر هەر هەلومەرجێکدا کە لەدەرەوەی دەسەڵاتی خۆیەتی، سوود لە دڵنیایی کۆمەڵایەتی وەربگرێت***). (جاڕنامە، ١٩٤٨دا، پەرەگرافی (٢٥).

نەک هەر ئەم بەندە، بەڵکو جاڕنامەی گەردوونیی مافەکانی مرۆڤ لە چەندین شوێنیتردا بەشێوەی ناڕاستەوخۆ باسی مافی نەخۆشی کردووە، یان ئەو مافانەی کە پەیوستیشن بە دۆخیی نەخۆشییەوە. وەک: (مادەی١) و مافی ژیان، (مادەی ٢) و مافی کەرامەتیی مرۆیی، (مادەی ٣) مافی سوودمەندبوون لە ئاساییش، (مادەی ٦) مافی پاراستنی زانیاریی تایبەت، مادەی ٨) مافی ژیان بەبێ هەڵاواردن و جیاکردنەوە، (مادەی ٢١) مافی سوودمەندبوون لە جیاوازیی کولتووری، ئایینی و زمان، (مادەی ٢٢) مافی منداڵان، (مادەی ٢٤) مافی بەساڵاچووان،

(مادەی ٢٥) مافی سوودمەندبوون لە هەلومەرجیی ویژدانیانە و دادەوەرانەی کار، (مادەی ٣١) مافی سوودمەندبوون لە ئاسایيشی کۆمەڵایەتیی و یارمەتیی کۆمەڵایەتی، (مادەی ٣٤) مافی پارێزگاریکردن لە ژینگە و دەروبەر، (مادەی ٣٧) مافەکانی پەیوەست بە بەکاربەرەوە، (مادەی ٣٨) پەیوەست بە ئازادیی تاکەکان لە گواستنەوە و شوێنگۆڕکێ. ئەم مافانە بنەمای کۆی ئەو بەیاننامانەن کە مافەکانی نەخۆشیان لەسەرەوە دارێژراوە، بۆ نمونە:

١. مادەی (١١) و (١٣)ی بڵاوکراوەی کۆمەڵگەی ئەوروپایی لە ساڵی ١٩٦١دا.
٢. مادەی (١٢٠١)ی کۆنڤاسیۆنی نێونەتەوەیی نەتەوە یەکگرتووەکان لەبارەی مافە ئابووری، کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکانەوە، لە ساڵی ١٩٦٦دا.
٣. بڕیارنامەی ژمارە (٢٣٠٤١)ی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی، لە ١٩٧٠دا.

## نەخۆشناسیی (Patientology) چییە؟

نەخۆشناسیی زاراوەیەکی هێشتا جێنەگرتووی لێکدراوە، کە لە دوو وشە پێکهاتووە: نەخۆش (Patient)، لەگەڵ ناسین، یان دانایی (Logos). بەمجۆرەش نەخۆشناسی ئەو جۆرەیە لە دانایی کە هەوڵی ناسینی نەخۆش دەدات وەکئەوەی مرۆڤە و ئەم ناسین و داناییەش بەشێکە لە ئاکار و پیشە و زانستی پزیشکی بۆ ئەوەی لە هاوکاریی و مامەڵەکردنیدا لەگەڵ مرۆڤی

نەخۆشکەوتوو، سوودی پراکتیکیی لێوەربگرێت. (Anne-Mette Graubek (red ٢٠١٠, p: ٩).

لێرەوە، نەخۆشناسی جۆرێکە لە دانایی و تێگەیشتن لە نەخۆش، وەکئەوەی مرۆڤێکە و پێویستیشە وەک ئەوەی ئازار دەکێشێ و لە دۆخێکی ناهارمۆنیی و ناهاوسەنگیی و جەستەیی و دەروونیی و کۆمەڵایەتیدایە، لێی تێبگەین و دۆخی نەخۆشبوونەکەی نەکرێتە بیانووی کەمکردنەوە لە بەها و نرخی مرۆڤبوونەکەی.

بەمجۆرەش، بارودۆخە ناهاوسەنگە کاتییەکەی نەخۆشبوون، هیچ ئەرکێکی کردەیی و ئەخلاقیی و ڕێزدارانەی پزیشک لە ئاستیدا کەم ناکاتەوە کە پێوستە بۆی ئەنجام بدرێ تا لەو بارودۆخە ڕزگاری ببێت، چونکە مرۆڤبوونەکەی هەمیشەییە و نەخۆشبوونەکەی کاتیی..

**لە هەمان کاتدا، نەخۆشناسی، بریتیە لە هاوارێک و پەنابردنێک بۆ پزیشک و کارگوزارانی بواری سیستەمی تەندروستی، تا بیریان بخاتەوە کە لە پشت نەخۆشەوە کەسایەتیی مرۆڤێکمان هەیە، کە ناکرێ بچووک بکرێتەوە لەو بارودۆخەی تیایدایە و لەپشت ئەم نەخۆشەوە، مرۆڤێکمان هەیە بە هەموو ڕەهەندەکانی کەرامەت و لەخۆتێگەیشتن (معرفە بالذات) و هووشیاریی مرۆییەوە، کە نابێت بێڕێزیی پێبکرێت، یان بەوجۆرە مامەڵەی لەگەڵ بکرێت، کە پیشانی بدات و وەها تێبگەیەنێت، ئێمە لە ئاست بارودۆخەکەیدا دەستەوەستانین و سستیی و بێموبالاتی لە ئاستدا پیشان دەدەین، یان هیچمان پێناکرێت و ئەگەر شتێکیشی بۆ بکەین، کاریگەریی نابێت، یان سوودی نابێت** (Larsen: ٢٠٠٨, p: ٦٣).

نەخۆشناسی ئەوەش دەگرێتەوە، کە ئێمە لە بواری پیشەکەی خۆماندا وەک پزیشک و وەک کارگوزارانی بواری تەندروستی وەک هاوولاتیان، دەتوانین لە چیرۆک و بەسەرهاتی نەخۆش لە کاتیی نەخۆشیی و ئازارچەشتندا، **تێبگەین** و ئەمەش رۆشنبیریی و دانایی ئێمە بە مرۆڤ و جیهانەکەی فراوان دەکات و سوودبەخشە. هەموو ئەمەش بەمانای ئەوەیە نەخۆش هەم پێویستی بە چارەسەری پسپۆڕیی و هەم یارمەتیدانی مەعنەوی و تێگەیشتنێکی ئۆنتۆلۆژیانە و کۆمەلایەتیانە و کولتووریانە هەیە و ئەمانەش تەواوکەری هونەری پزیشکین و لە بواری پراکیتیکدا نابێت لیکتر جیا بکرێنەوە.

هەرچەندە لە ڕوویەکی ترەوە، نەخۆشناسی ئەرکی پزیشک لە ئاست مرۆڤی نەخۆشدا دەباتە سەرێ، بەلام ئەوەندەش پێگەی پزیشک وەک کەسایەتیی و پسپۆڕیی لە کۆمەڵگەدا بەرز دەکاتەوە و پزیشکیی لە پیشەیەکەوە بەرز دەکاتەوە بۆ ئەرکێکی ئەخلاقیی بەرز و ڕێزلێگیراوی متمانە پێکراو.

بۆیە دەتوانین، بڵێین، لە ئاکاری پزیشکیدا، سێ ڕەهەندیی پێکەوە بەستراوی گرنگمان هەیە، کە هەرسێکیان لە بواری کردەیی و ئەنجامدانی ئەرکی پزیشکیدا بەرجەستە دەبن و لێکدی جیا ناکرێنەوە:

**یەکەمیان:** ئەوەیە، کە پزیشکیی (***زانست/ Science***)یکە و بنەما و ڕێنمایی و دیسیپلینی زانستیانەی خۆی هەیە و پسپۆڕییەکی تایبەتە، تاکەکەس لە ڕێگەی خوێندن و خۆپێوەخەریککردنی تیۆری و پراکتیکی، دەتوانێ نازناوی (پزیشک) بەدەست بهێنێت و تیایدا شارەزا و کارامە بێت و

هەموو متمانەیەکی خەڵک بە خۆی و پیشەکەی ڕابکێشێت و لە سایەیدا خزمەت بکات و بحەوێتەوە و نانی خۆی پەیدا بکات.
**دووەمیان:** ئەوەیە کە پزیشکی (**پیشە/*Profession***)ێکە، تیایدا بنەما زانستیی و دیسیپلینەکانی لە میانەی کاری پراکتیکیدا جێبەجێ و ڕەچاو دەکرێن و پزیشک بە ڕەچاوکردنی بنەما زانستی و ئەو ڕێنماییانەی لە بواری خوێندنی پزیشکیدا فێریان بووە، بڕیاری پراکتیکی دەدات بە ئاراستەی چارەسەری نەخۆشیی مرۆڤی نەخۆشدا و گێرانەوەی بۆ دۆخیی هارمۆنیی و هاوسەنگیی و سرووشتیی خۆی..
**سێیەمیان:** ئەوەیە کە پزیشکی جۆرێکە لە (**هونەر/*Art***) یان توانایی (***Ability***)، چونکە مژدەی چاکبوونەوە بە نەخۆش دەدات و دەیگێڕێتەوە بۆ دۆخی هارمۆنییی مرۆییانەی خۆی، تا بتوانێ جوانیی و خۆشبەختیی و چێژ و داهێنان لە ژیانی خۆیدا بدۆزێتەوە، کە دۆخی نەخۆشبوونەکەی ڕێگریی لێدەکات ئەم تواناییانەی بخاتە واری جێبەجێکردنەوە.
بەمجۆرەش دەتوانین بڵێین: نەخۆشناسیی بریتیە لە توانا و ویستی پزیشکەکان و کارگوزارانی پزیشکی و سیاسەتی ساخڵەمی لە وڵاتێکدا، کە ئامانجیان بریتیە لە گێڕانەوەی ئاسوودەیی و بەختەوەریی بۆ مرۆڤ، تا ئەم مرۆڤە لەو دۆخی نەخۆشییەی دووچاریی بووە بگەڕێتەوە بۆ دۆخێک، کە تیایدا هیچ جۆرە گیرۆدەبوونێکی بەو ئازارانەوە نامێنێت، کە ڕێی لێدەگرن تا وەک کەسێکی خاوەن بەهرە و توانایی تایبەت لە کۆمەڵگەدا کارایی خۆی بسەلمێنێ و ژیانی ئاسایی خۆی هەڵسوڕێنێ. ئەم ڕەهەندەی سیستەمی تەندروستی و پیشە و زانست و هونەری پزیشکی، ڕەهەندێکی مژدە بەخش و

ئومێدبەخشە و بڕوای مرۆڤ بە داهاتوو، بە خەونی چاکبوونەوە و خۆگریی لە ئاست ئازار و ئەزموونەکانی نەخۆشیدا زیاد دەکات..

## نەخۆشیی و تەندروستی:

مرۆڤ چ کاتێک نەخۆشە و چ کاتێک تەندروست؟ هیچکاتێک توێژەران نەیانتوانیوە پێناسەیەکی چونیەک و ستاندارد بۆ چەمکیی تەندروستیی و نەخۆشیی بکەن. ڕێگرێکی هەرە گەورە لەم نێوانەدا ئەوەیە ئایا مرۆڤ چۆن لە ئاستی ئەزموونی تایبەتیی خۆیدا (تەندروستیی) لە (نەخۆشیی) جیا دەکاتەوە؟ ئایا ئەوەی تاکەکەس بە ساخڵەمیی خودیی خۆی دەزانێت و ئەزموونی دەکات، دەتوانێ بەسەر گشت کەسەکانیتردا بیگشتێنێ و ئەم داناییە خودییە لەسەر ساخڵەمیی و نەخۆشیی بکاتە پێوەرێکی دانایی بۆ گشت ئەوانیتر تا بەهۆیەوە ساخیی لە نەخۆشیی جیا بکرێتەوە؟ (لامبوس: ٢٠٠١، ل: ٦٥٨).

مەرج نییە ئەو کاتەی مرۆڤ نەخۆش نییە، یان ئازاری نییە، تەندروست و ساخڵەم بێت. هەموو نیشانەکانی نەخۆشیی و بیماری لە جەستەدا دەرناکەون و بۆی هەیە سەرچاوەیەکی کۆمەلایەتیی و کولتوورییشیان هەبێت. مرۆڤ زۆرجار نەخۆشێکی تاکەکەسی نییە، هێندەی ئەوەی لە ڕووی کولتووریی و کۆمەلایەتییەوە نەخۆشخراوە. هەندێک لە ئێمە بەعزێ هەستکردنی تایبەتیی خۆی وەک نیشانەی نەخۆشکەوتن لێکدەداتەوە و ڕێی پزیشک و نەخۆشخانە دەگرێتە بەر، هەیە نیشانەی ڕاستەقینەی نەخۆشییەکی تایبەتی لێدەرکەوتووە و کەچیی هەمان هەستی لادروست نابێت، ئەگەرچی بە نەخۆشییەکە ئالوودە بووە. کەسانێکیش هەن ئەگەر بەدەست خۆیان بێت، لە جێگەی مردنیشدا بێت ناچنە لای دکتۆر (لامبوس: ل: ٦٥٨-٦٥٩).

بەپێی پێناسەی ***ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی*** (WHO)، تەندوستی هەر تەنیا ئەو بارودۆخە نییە کە لە غیابی نەخۆشیدا پەیدا دەبێت، بەڵکو ئەو بارودۆخەیە کە تیایدا تاکەکەس هەست بە ئەوپەڕی ئاسوودەیی دەروونی، مێنتاڵی و کۆمەڵایەتیی دەکات (http://kosmos.ucsyd.dk).

بەمجۆرەش، تەندروستی هەر تەنیا دووریی لە نەخۆشیی جەستەیی نییە، بەڵکو دوورییشە لە کۆی ئەو ژینگە کۆمەڵایەتیی و کولتوورییانەی کە کاریگەرییان لەسەر بارودۆخیی دەروونیی و مینتاڵیی تاکەکەس هەیە و ئاسوودەیی تاکەکەسیانە لە کێشە مێژوویی و نەریتی و بۆماوەییەکانەوە دەگلێنن. ئەنتۆنی گیدنز، لەو بڕوایەدایە:

> (***ساخلەمیی و نەخۆشی بە تۆرەی خۆیان، بە توندیی لەلایەن ڕەهەندە جۆربەجۆرەکانی بونیادی کۆمەڵایەتییەوە کاریگەرییان دێتەسەرێ. هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان نەک هەر تەنیا کاریگەریی دەکەنە سەر جۆری لە بڕوا و هیواداریی بە ژیان، بەڵکو کاریگەرییشیان لەسەر گریمانەی تووشبوون بە جۆرەها نەخۆشیی و ئەو چاودێرییە تەندروسیتیانەی پیشکەش بە نەخۆشەکانیش دەکرێن، هەیە***) (گیدنز: ١٩٩٩، ل: ٦٣٢).

بەمجۆرەش نەخۆش و نەخۆشیی هەردەم لە پێشزەمینەیەکدا سەر هەڵدەدات، کە کاریگەریی خۆی لەسەر جۆری نەخۆشییەکە و ماوەی نەخۆشیی و چۆنێتیی چاودێریی پزیشکیی و تەندروستیی و چاکبوونەوەی نەخۆش، هەیە.

هەندێک لەو باسانەی لەمبارەیەوە بەرهەمهاتوون، بە شێوەیەکی بنەبڕ پێناسەی تەندروستیی و ساخڵەمیی دەکەن و بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە تاکەکەس دەتوانێت بە هۆی ناسینەوەی ئەو خەسڵەتانە لە خۆیدا، لە لەشساخیی خۆی دڵنیابێتەوە. هەندێک لەو خاڵانە ئەمانەن کە بەهۆیانەوە کەسەکە:

١. هەست بە خۆشیی و بڕوابەخۆبوون دەکات.
٢. جەستەی پتەو، بەهێز و بەرگەگرە.
٣. ماسولکە و چنینی جەستەیی توندوتۆڵن.
٤. پێستی ساف و لووسە و نیشانەی ماندوویی پێوە نییە.
٥. بەباشی دەبیستێ، چێژدەکات، بۆن دەکات، دەبینێ و هەستدەکات.
٦. هیچ بەشێک لە جەستەی شین و مۆر نەبۆتەوە و هەست بە ئازار ناکات.
٧. بە ئاسانیی ئەرکە ڕۆژانەییەکان جێبەجێ دەکات.
٨. وزەی پاشەکەوتکردووی هەیە و بەرگەی کاری زۆر دەگرێت و لە کاتی ماندووییشدا، دوای پشوودان و خەوتن، دەتوانێت لە نوێ دەستپێکاتەوە (http://www.nomedica.dk).

وێڕای ئەوەی کە بەپێی تێڕوانینە کولتوورییەکە، نەخۆشیی و ساخڵەمیی هۆکاری ناجەستەیی و دەرەکەسییان هەیە، بەڵام زانستیی پزیشکیی مۆدێرن ڕوانگەیەکی فیزیکی بۆ نەخۆشیی هەیە، کە لەسەر بنەمای چەند خاڵێک وەستاوە:

- گرنگیدان بە ڕواڵەتی جەستە و ئەندامەکانی نەخۆش، بەبێ لەبەرچاوگرتنی پەیوەندیی نێوان هۆش و جەستە، یان ئاسوودەیی جەستەیی و ئاسوودەیی هۆشەکی.
- ئاراستەبوون بەرەو چارەسەرکردن و مامەڵەکردن لەگەڵ هۆکارەکان.
- تێگەیشتن لە نەخۆشی وەک شتێکی سەربەخۆ کە هەڕەشەیە لەسەر ساخڵەمیی تاکەکەس. بەپێی ئەم ڕوانگەیە نەخۆشیی مشەخۆرێکی بێگانەیە و پێویستە لە جەستە بکرێتە دەرەوە.
- پشکنین و وردبوونەوە لە تاکەکەس بەو پێیەی ئەو شوێنەیە کە نەخۆشیەکە لێیداوە و پاشان دۆزینەوەی ڕێگایەکی گونجاو بۆ چارەسازی.
- بڕوابوون بەوەی کە باشترین شوێنی چارەسەرکردن بریتیە لە کەش و ژینگەی پزیشکی و نەخۆشخانە، نەک ئەو شوێنەی نەخۆشییەکە تیایدا سەریهەڵداوە. (لامبوس: ل: ٦٦٩).

ئێمە بەلەبەرچاوگرتنی ئەم بنەما پزیشکیانە نەخۆشکەوتنی مرۆڤ تەماشا دەکەین و بە پلەی یەکەم دەیبەستینەوە بەو حاڵەتەوە کە مرۆڤ لە ڕووی جەستەییەوە هارمۆنیی و گونجانی تەن و جەستەی تێکدەچێت و پیویستیی بە هاوکارییەکی پڕۆفێشناڵ و دامەزراوەی تەندروستیی هەیە بۆ دەستنیشانکردنی زانستیانەی نەخۆشییەکەی و چارەسەری دەرمانی(گیدنز: ل: ٦٣٣). ئەمە ڕزگاربوونیش لەو بارە ژینگەییە دەگرێتەوە کە تیایدا نەخۆشکەوتووە، تا ئەو دەمەی

توانای هەیە بگەڕێتەوە بۆ دۆخیی کۆمەڵایەتیی و سرووشتیی و هاوسەنگانەی خۆی، بەجۆرێ کە بتوانێ کار و چالاکییە ئاساییەکانی خۆی ئەنجام بدات و توانای ئومێدەواربوونی بە ژیان بەدەست بهێنێتەوە.. ئەوەش لەبەرچاو دەگرین، کە ڕەنگە پزیشکیی و دامەزراوەی تەندروستی نەتوانێت ئەو ژینگە کۆمەڵایەتیی و کولتوورییە بە ئاسانیی بگۆڕێت، بەڵام لە کاتی پێشکەشکردنی خزمەتگوزارییەکانیدا، نەخۆش لەو ژینگەیە دابڕ دەکات و دووری دەخاتەوە و بەپێی دیسپلینێکی تایبەت کە پەیوەندیی بە لایەنیی کارگێڕییەوە هەیە، دیدار و سەردانەکان بۆ لای نەخۆش سنووردار دەکات تا چاکبوونەوە و لەخەم ڕەخسانی.. هەرچەندە لە هەرێمی کوردستاندا ئەمەش سنووردار ناکرێت و گووشاری کەسوکاری نەخۆش و پاڵنەرە کۆمەڵایەتی کولتوورییەکان، دەبنە گووشار بەسەر نەخۆش و نەخۆشخانەشەوە..

## فەلسەفە:

وشەی فەلسەفە لە دوو دەربڕین پێکهاتووە: **یەکەم: (فیلۆ) بە مانای خۆشەویستی و دووەم: (سۆفیا) بە واتای دانایی و حیکمەت، بەمجۆرەش** وشەی فیلۆسۆفیا بە مانای خۆشەویستی بۆ دانایی، دۆستایەتی دانایی، یان: ئەڤینداریی دانایی هاتووە و فیلۆسۆف، ئەو کەسەیە کە عاشقی داناییە. بەو مانایەی کە فەیلەسووف جگە لە دانایی ڕاستەقینە و تێگەیشتن لە چییەتی شتەکان هیچ ئامانجێکی تری نییە و بۆ ئەمەش پشت بە لێکدانەوەی هزریی و ئەقڵیی مرۆڤ دەبەستێت، نەک شتێکی تر.. بۆیە گوتویانە: فەلسەفە

چالاکییەکی ڕۆشنبیرانەیە کە لەسەر ڕێبازی ئەقڵی و سەلماندنی لۆژیکیانە بەندە و کارەکانی خۆی پێشدەخات (Mautner: ٤٦٦).

لێرەشەوە، ئێمە پەیوەندیی نێوان زانستی پزیشکیی و فەلسەفە، وەک میتۆدێک لە باسەکەماندا دەخەینە ڕوو بۆ ئەوەی بتوانین لە دواجاردا لە ڕوانگەی فەلسەفییەوە باس لە مافەکانی نەخۆش و گرنگیی و ڕەچاوکردنیان لەلایەن سیستەمی تەندروستی و پزیشکەکانەوە بکەین، چونکە پزیشکەکان بە دانایی فەلسەفییەوە لەسەر مرۆڤ، بەو برِە تێگەیشتنەوە کە فەسەفە لەسەر مرۆڤ دەیخاتە بەردەستیان، باشتر لە دۆخی نەخۆشبوونەکەی تێدەگەن. ئەم تێگەیشتن و داناییەش بەشێکە لە ئاکاری پزیشکی لە مامەڵەکردنیدا لەگەڵ نەخۆش، بەو پێیەی مرۆڤێکە و بوونەوەرێکی دەگمەن و دانسقە و بێنموونەیە و پێویستە لە هەر جۆرە بڕیاردانێکدا لەبارەیەوە ڕەچاوی ئەم بێنمونەیی و دانسقەبوونەی بکرێت.
کەواتە ***ئاکاری پزیشکی*** خاڵی هاوبەشی نێوان فەلسەفە و زانستی پزیشکییە، چونکە سەروکاری هەر یەک لە پزیشک و فەیلەسووف لەگەڵ مرۆڤە بە پلەی یەکەم و ئەویش لەسەر بنەمای ئەقڵیی و تێگەیشتنی ژیرانەوە بەندە، کە هەم پسپۆڕیی و پیشەی پزیشکیی و هەم فەلسەفە وەک جۆرێ لە دانایی و ڕێبازێک بۆ توێژینەوە پێوەی پابەندن..
بەدیوێکی تردا، فەلسەفە و پزیشکی هەردووکیان عەوداڵی دانایی زیاترن سەبارەت بە بوون و هەلومەرجەکانی بوون و مانەوەی مرۆڤ. لە هەردووکیاندا ئاستێک لە تەندروستی لەپێشچاوگیراوە: لە فەلسەفەدا تەندروستی بریتیە لە

بیرکردنەوەی ژیرانە و تێگەیشتنی لۆجیکیانە لە مرۆڤ و جیهان. بڕی ئەو ئەقڵانییەتەی لە ژیانی تیۆری و کردەیی مرۆڤدا لە ڕێگەی فەلسەفەوە بەدەستمان دەگات، دەستنیشانی ئاستی تەندروستیبوون و ئەخلاقیبوونی ژیانەکەی دەکات. لە پزیشکیدا بڕی هارمۆنیی و سرووشتیبوونی ڕەهەندی جەستەیی و دەروونیی و ڕۆحیی پێوەرن بۆ ئاستی تەندروستیی مرۆڤ و ساخڵەمییەکەی. بەمجۆرەش چ لە فەلسەفە و چ لە پزیشکیدا پێوەری تەندروستی بریتیە لە دۆخێکی هارمۆنی و سرووشتیانە کە بەهۆیەوە ژیانی مرۆڤ هەڵدەسەنگێنرێت. لێرەشەوە چ پیشەی پزیشکی ئاستێک لە فەیلەسووفبوون دەخوازێت و چ فەیلەسووفیش پێویستیی بەوەیە شارەزاییەکی پزیشکیانەی لە مرۆڤ هەبێت.

# سێ پزیشکیی فەیلەسووف

ئێمە ئەم پەیوەندییەمان بە گەڕانەوە بۆ بەرهەمی سێ پزیشکی فەیلەسووف، لە سێ قۆناغی جیاوازیی مێژووی پزیشکیدا بۆ ئاشکرا بووە: پزیشکی گەورەی یۆنان (هیپۆکراتیس و پزیشکی ڕۆمی گالینۆس و مەزنە پزیشکی مسوڵمان: ئیبن ڕەزوانی میسری لە سەدەی پێنجەمی کۆچیدا) (محقق: ١٩٩٥، ل: ٢٧٣-٢٧٤).

هەریەکە لەم پزیشکە فەیلەسووفانە، جەخت لەسەر گرنگیی دانایی فەلسەفییانە و تێگەیشتنی فەلسەفیانەی پزیشکەکان، لە نەخۆشەکانیان دەکەنەوە و ئەمەش یەکێکە لەو پرانسیپانەی ڕێگەمان پێدەدات کە بڵێین: پەیوەندیی نێوان فەلسەفە وەک جۆرێک لە بیرکردنەوە و پزیشکیی وەک جۆرێ لە زانست و پراکتیک، پەیوەندییەکی بنەمایی و جەوهەرییە و بەبێ ئەوەی یەکەمیان، ئەمەی دووەمیان ئامانجەکانی خۆی ناپێکێ و بەبێ ئەمەی دووەمیشیان فەلسەفە لە زۆر ڕەهەندیی بوونی مرۆیی تێناگات کە پەیوەندیی بە نەخۆشبوونەکەیەوە هەیە، چونکە بەوەی مرۆڤ نەخۆش بکەوێت، ناکەوێتە دەرەوەی بیرکردنەوەی فەلسەفی.

لێرەشەوە، هەرچەندە مێژووی فەلسەفە لە مێژووی پیشەی پزیشکیی بە تێگەیشتنە ئەمرۆییەکە کۆنترە، بەڵام هەر لە سەرەتای زانستیی پزیشکییەوە، فەلسەفە بەشدارییەکی گرنگ لە پێشخستن و پەرەپێدانی ئەم پیشەیەدا دەکات و ئاکارێکی تایبەت بەخۆی بۆ دادەمەزرێنێ، کە پێی دەگوترێ ئاکاری پزیشکی. لە ئەنجامی پەیڕەوکردنی پزیشکەکانیش بۆ ئەم ئاکارەوەیە، کە پیشە و هونەر و زانستەکەیان بە شێوەکی فەلسەفییانە پێشدەخەن و لە بواری کردەیی و تیۆریدا دەیخەنە خزمەت مرڤایەتیەوە.

ئەو نمونانەی لە مێژووی پزیشکیدا بوونەتە بنەمای ئاکارناسیی و نەخۆشناسی، بەپێی ڕیزبەندیی مێژوویی ئەو ناوانەن کە پاشتر باسیان دەکەین.. ئێمە ئەو ناوانەمان لە ناو چەندین ناویتردا هەڵبژاردوون، لەبەر ئەم هۆکارانەی خوارەوە:

**یەکەم:** پەیوەندییەکی بنەمایی لە بیرکردنەوە و شێوازیی کاریی هەر سێک لەو پزیشکانەدا هەیە، سەبارەت بە پیشەکەیان و مرۆڤناسیی و مافەکانی نەخۆش (محقق: ١٩٩٥، ل: ٢٧٤ و بەرەودوا).

**دووەم:** هەموویان جەخت لەسەر گرنگیی فەلسەفە و تێگەیشتنی فەلسەفیانە لە مرۆڤ و نەخۆش دەکەنەوە.

گالینۆس، پزیشکی گەورەی ڕۆمیی لەمبارەیەوە گوتویەتی:

> **(ئەگەر پزیشک شوێنپێی هیپۆکراتیس بکەوێت و ڕێباز و میتۆدی ئەو بگرێتەبەر، هیچی لە فەیلەسووف کەمتر نابێت.** (جالینوس: ١٩٩٥، ص: ٢٩٦)

**سێیەم:** هەموو ئەم پزیشکانە جگە لەوەی سەر بە ڕێبازیی زانستییانەی پیشە و پسپۆڕیی و هونەری پزیشکین، بەمانا ئەمرۆییەکەی، هەروەها دەستپێشخەرییان کردووە بۆ جیاکردنەوەی زانستیی پزیشکی لە جادوو و دۆعا و شێوازەکانیتری چارەسەری نازانستی، ئاواش بە درێژکراوەی هەمان ڕێباز دەژمێردرێن و سەر بەهەمان ڕێچکەی زانستیی و ئاکاریی پزیشکین کە هیپۆکراتیس دایمەزراند (جورج سارتن: ١، ٢٠٠٩، ل: ١١٨)..

**چوارەم:** ئاکاری پزیشکی و مافەکانی نەخۆش، لە زانستیی پزیشکیدا پرانسیپێکی جیهانگرەوەیە و لەلای یۆنانیی و ڕۆمیی و مسوڵمانەکان و لە کۆی شارستانییەتە خاوەن پێشینەکانی ئەم زانستەدا وەک یەک گرنگیی پێدراوە، بۆیە هەڵبژاردنمان بۆ (ئیبن ڕەزوانی میسری)، گەورە پزیشکی مسوڵمان، لەم ڕوانگەیەوە بووە، تا پیشانیی بدەین، وابەستەیی پزیشکە فەیلەسووفەکان بە پیشەکەیانەوە، لەودیو ئینتیمای جوگرافیایی و ئایینی و ڕەگەزییەوە بووە و هەموویان وەکو یەک جەختیان لەسەر بنەما زانستیەکان و ئاکارییەکان کردۆتەوە، بەبێ جیاوازیی.

ئەمانەش ئەو سێ نمونەیەن کە بە تێگەیشتنی ئێمە بنەمای ئاکاری پزیشکیی دێرینەیان دامەزراندووە و لەسەری ڕۆیشتوون و بەتەواویی لە مافەکانیی نەخۆش شارەزا بوون و ڕەچاویی کەرامەتیی مرۆییان کردوون.:

- ***هیپۆکراتیس*** (٤٧٠-٣٦٠ پ.ز)، ***جالینۆس*** (١٢٩- ٢٠٠ پ. ز)، ***ئیبین ڕەزوانی میسری*** (سەدەی پێنجەمی کۆچی).

## خاڵە هاوبەشەکانیان:

دوایئەوەی گرنگیی باسەکە و میتۆد و زاراوەکان و هۆکاری هەڵبژاردنیی ئەم پزیشکە فەیلەسووفانەمان باسکرد، لەمەودوا بۆ ئەوەی باسەکەمان درێژە پێبدەین، سەرەتا بە کورتیی باسی خاڵە هاوبەشەکانی ئەم پزیشکە فەیلەسووفانە دەکەین و لە بەشێکی تردا بە دووورودرێژتر لەسەر یەکەم پزیشک، کە (هیپۆکراتیس)ی خەڵکی (کوسی)یە، دەوەستین.

بەپێی وردبوونەوەمان لە بەرهەمی ئەم پزیشکانە، کە بەشێوەیەکی پوختەکراو لە کتێبەکەی توێژەری ئێرانیی (محقق: ١٩٩٥) کۆکراونەتەوە و چاپ و بڵاوکراونەتەوە، ئەم خەسڵەتە هاوبەشانە دەدۆزینەوە.

وێڕای ئەو ماوە زۆرەش کە دەکەوێتە نێوان ژیان و چالاکیی ئەم پزیشکە فەیلەسووفانەوە، کەچی دەبینین پابەندبوونی ئەوان بە بنەمای ئاکاریانەی پیشەکەیانەوە بە نەگۆڕیی دەمێنێتەوە و جیهانبینی پزیشکی لە پەیوەندیی قووڵیدا بە فەلسەفەوە، لێی دەکۆڵرێتەوە و لەو ڕوانگەیەوە بنەماکانی نەخۆشناسیی پتەودەکرێن.

گرنگترین خاڵی هاوبەشیش ئەمانەن کە لەم بەشەی لێکۆڵینەوەکەماندا دەیانخەینە ڕوو و لە پاشانیشدا بۆ درێژەدان بە باسەکانی دواترمان لەسەر هیپۆکراتیس، سوودیان لێوەردەگرین.

ئەگەر خوێنەر بەرهەمی ئەم سێ پزیشکە، بخوێنێتەوە بە ڕوونیی بۆی دەردەکەوێ کە هەرسێکیان لەسەر یەک هێڵی بیرکردنەوە دەڕۆن، کە تێڕوانیی پیشەییانەی پزیشکی و تێگەیشتنی فەلسەفیانە لە مرۆڤ، تیایدا ئامادەییان هەیە، ئەمەش ئەو خاڵە هاوبەشانەن:

١. پەیوەندیی ڕاستەوخۆی نێوان تێگەیشتنی فەلسەفیی و تێگەیشتنی پزیشکی لە مرۆڤ. ئەمەش مەرجی فەیلەسووفبوونی پزیشک و پزیشکبوونی فەیلەسووف بەرجەستە دەکات. چونکە ئەم پزیشکانەی ناومان بردن، لەو بڕوایەدان بۆ تێگەیشتنێکی ڕاستەقینە لە نەخۆشیی وەک دۆخێکی کاتیانەی شێواو لە ژیان و هاوسەنگیی مرۆییماندا، پێویستیمان بە تێگەیشتنی ئاکاریانە و فەلسەفییانە لە مرۆڤ، لە دۆخی تەندروستانەیدا، هەیە.
٢. پزیشکە فەیلەسووف لە ئاست نەخۆش و ناسینی تایبەت و گشتیی هۆکاری نەخۆشییەکەی و دۆزینەوەی چارەسازیی گونجاو کە لە ڕووی ئەخلاقییەوە، پەسەند بێت، بە مەبەستی دۆزینەوەی تەندروستی وەک ڕێگایەک بۆ بەختەوەریی مرۆڤ. بەلای ئەم پزیشکە فەیلەسووفانەوە، پزیشکیی پیشەیەکی مژدەبەخشە و کاری پزیشک بریتیە لە گێڕانەوەی ئومێد بۆ مرۆڤ و ڕزگارکردنی لە دۆخی نەخۆشی تاکو بتوانێت بەردەوام بێت لە پەروەدەکردنی خۆی و پەروەردەکردن و

وەبارهێنانی مرۆیانەی خۆیدا. چونکە ئەگەر مرۆڤ نەخۆش بێت، هاوسەنگیی تێکدەچێت و ناتوانێت خۆی پەروەردە بکات و داهێنان بکات. داهێنانیش ساتەوەختێکە پەیوەستە بە تەندروستی و هاوسەنگییەوە.

٣. ئەم پزیشکانە بە وردی و دڵنیاییەوە، سوورن لەسەر ئەوەی کە دەبێت پزیشکەکان لە کاتی ئەنجامدانی پیشەکەی خۆیاندا، ڕەچاوی مافی مرۆیی کەسەکان بکەن وەک مرۆڤی خاوەن کەرامەت و گەورەیی و خاوەن عیزەتی نەفس، مامەڵەیان لەگەڵ بکەن و مافەکانیان وەک نەخۆش ڕەچاو بکەن.

بەهۆی ئەم خاڵە هاوبەشانەوەیە، کە ئەمڕۆکە دەتوانین، جارێکیتر، بگەڕێینەوە بۆ مێژووی زانستی پزیشکیی و هەر لەناو ئەم مێژووە خۆیدا بنەما ئاکارییەکانی پیشەی پزیشکی، بدۆزینەوە. ئەو بنەمایانەی لە ئێستای دامەزراوە تەندروستیەکانی وڵاتەکەمان و لە پەیوەندیی نێوان پزیشک و نەخۆشدا چیتر بەهێز نین و ئەمەش دابڕانێکی نێگەتیڤانەی پیشەی پزیشکی لە بنەما زانستی و مێژوویەکەی خۆی ئاشکرا دەکات.

جگە لەوەی پێویستە ئەم زانستە بە بنەما ئاکارییەکانی خۆی ئاشنا بکرێتەوە و لە زانکۆکان و کۆلێژ و بەشەکانی پزیشکیدا گرنگیی بە خوێندنی ئاکاری پزیشکی و مافەکانی نەخۆش بدرێت و لەلایەن پسپۆڕانیی فەلسەفەوە بگوترێنەوە، ئاواش پێویستە بەبەردەوامیی خولی ڕاهێنان بۆ پزیشکەکان، پەرستاران، پزیشکانی خولاو (مقیم)، کارگوزارانی

نەخۆشخانەکان و بنکە تەندروستیەکان بکرێتەوە و ئاشنا بکرێنەوە بەو بنەما فەلسەفییانەی بەردی بناخەی پیشەکەیانن.
هەر لەسەر ئەم بنەمایەشەوە بوو، کە ئیمە بیرمان لەم توێژینەوەیە کردەوە تا بەشدارییەکی فەلسەفییانە بێت، بە ئاراستەی پتر مرۆڤانەکردنەوەی زانستیی پزیشکی و ئاشتکردنەوەی لەگەڵ پرانسیپە ئاکارییەکانیدا لە بواری پراکتیکی و ئیشی ڕۆژانەدا..

# هیپۆکراتیس (٤٧٠-٣٦٠ پ.ن):

**پێشینەی پزیشکی لە یۆنانی کۆندا:**

نەریتی یۆنانیی لە بواری پزیشکیدا ڕەگوڕیشەیەکی ئەفسانەیی هەیە و لە بنەمادا ئەم پیشەیە پەیوەستکراوە بە نەمریی مرۆڤەوە. لە بڕوای یۆنانییە کۆنەکاندا بەو هۆیەوە کە پزیشک توانای چارەسەرکردنی نەخۆشیی هەیە، بۆی هەیە مرۆڤ نەمر بکات. هۆمێر لە کتێبی (ئەلیادە)دا، باسی (ئەسکالبیۆس)، وەک یەکەم پزیشک دەکات، کە پاشان بەهۆی هەورەبرووسکەی ڕقی (زیۆس)ـەوە دەکوژرێت، نەبا بەهۆی هونەری پزیشکیەکەیەوە، مرۆڤ بگەیەنێتە ئاستی نەمریی و لە خواکان یاخیی ببێت. (کۆلین ئەی. رونان: ٢٠٠٣، ل: ١٢٠).

پێش هێپۆکراتیس چەند ئاراستە و فێرگەیەکی هونەر و پیشەی پزیشکی لە یۆناندا باو بوون، لەوانەش فێرگەی پیتاگۆراسییەکان (سیوەیلی: ٢٠١٢، ل: ٩١و بەرەو دوا). ئەمانە بڕوایان وابووە، تەندروستیی بەرەنجامی هاوسەنگیی هێزە ناخەکییەکانی جەستەیە. فێرگەی دووەم بریتیبوون لە پەیڕەوکارانی ئەمپادۆکلیس (هە. س، ل: ٢٨٣-٣١٢) پاشان ئەم

فێرگەیە لە دوورگەی سیسیلیا گەشەی کردووە و جەختیان لەسەر گرنگیی هەوا بۆ ناوەوە و دەرەوەی جەستە کردۆتەوە. سەرچاوە مێژووییەکان، لەوانەش: (خدادادیان: ٢، ١٩٩٥، ل: ٨٩٤-٩١١)، جەخت لەوە دەکەنەوە، کە هەتا هونەری پزیشکی سەربەخۆیی خۆی لە شێوازەکانی چارەسەری نازانستیی و خورافی و ئایینی وەرگرتبێ، زیاتر گەشەی کردووە و بەرەو کاری پیشەیی چووە. لێرەوە سێیەم فێرگەی پزیشکی، کە لە ئەیۆنیا بووە گرنگیی بە شێتەڵکاریی جەستەیی داوە. چوارەمین فێرگەش لە (ئابێدرا) بووە. لەم فێرگەیەدا گرنگیی بە ژەمەخۆراکەکان و ڕاهێنانی جەستەیی دراوە. (ڕونان: ٢٠٠٢، ل: ١٢١). بە بڕوای من هەموو ئەم ئاراستە پزیشکیانەی یۆنان، کاریگەریی ڕەوتی پزیشکی چینی و هیندیی و بابلی و سۆمەرییان لەسەر بووە، چونکە لە نەریتی پزیشکی ئەم شارستانیانەدا، جەستەی مرۆڤ وەک بەشێک لە جەستەی گەردوون تەماشای کراوە و دەرمانچاری و چارەسازیی ئەم نەریتە پەیوەست بووە بە ژینگەی ئەو شوێنەوە کە مرۆڤی لێدەژی..

لێرەشەدا بە ئاشکرا ڕەنگدانەوەی فەلسەفە و شێوەژیانی فەلسەفیانەی پیتاگۆراسی دەبینرێتەوە، چونکە پیتاگۆراسیەکان بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگیی نێوان ڕۆح و جەستە و بیرکردنەوە، دوورەپەرێزیی و پارێزکردنیان کردبووە مەرجی ئەندامبوون لە گروپەکەیاندا. ئەمە جگەلەوەی پیتاگۆراسییەکان لەژێر کاریگەری شارستانییەتەکانیتردا بوون. (سیوەیلی، هە. س. ل: ٩٥-٩٦).

## فێرگەی هیپۆکراتیس:

هیپۆکراتیس خەڵکی شاری کۆس (Cos)ی سەربە یۆنان بوو. لە سەردەمێکدا ژیا، کە بزووتنەوەیەکی زانستیی و فەلسەفیی بەهێز لە یۆناندا هەبوو. بۆیە لە سەدەی پێنجەم و چوارەمیی پێش زاییندا، نەریتێکی پزیشکیی نوێی هێنایە ئاراوە کە زیاتر دنیایی و ئەزموونگەرایانە بوو تا ئەفسانەیی و خورافەباوەڕانە.

هێپۆکراتیس، لە بنەماڵەیەکی زانستپەروەر بووە و پیشەی پزیشکیی بە میرات بۆ ماوەتەوە. فەلسەفەی لەلای دیموکرتیۆس (٤٦٠-٣٧٠ پ.ز)، خوێندووە و لەم فەیلەسووفە ناودارەوە نزیک بووە. (بڕوانە:Fabricus: ١٩٦٥, p: ٧٧، گمبرتس: ١، ١٩٩٦، ص: ٣٥١، یگر: ٢، ١٩٩٧، ل: ٥٦٨-٦١٧).

هیپۆکراتیس نزیکەی (٦٠-٧٠) باسی پزیشکیی نووسیون، (لیندبرگ: ١٩٩٨، ل: ١٥٦)، یان بە پەیڕەوی لە بیروباوەڕەکانی ئەو، ئەم بەرهەمانە تۆمار کراون و پاشان بەناوی دەقەکانی هیپۆکراتیسەوە وەرگێڕدراون بۆ سەر زمانەکانی عەرەبیی و سریانیی و عیبری (خدادایان: ٢٠٠٦، محقق: ١٩٩٥، alaam. Tahoor. Com).

کاکڵەی بیرکردنەوە پزیشکیەکانی هێپۆکراتیس و پەیڕەوکارانی ئەمانە بوون:

١. پزیشکیی پیشە و زانستێکە لەسەر بنەمای دۆزینەوەی هۆکارەکان و دەستنیشانکردنی چارەسەر، دامەزراوە. بەم هۆیەشەوە هێپۆکراتیس ئەوەی ڕەتکردۆتەوە کە نەخۆشکەوتن هۆکاری ئاسمانیی و پیرۆز، یان نادیاریی هەبێت:

**(نەخۆشکەوتن بە هۆکاری هێزە باڵاکان و پیرۆزەکان بەهەمان هۆکاری نەخۆشییەکانیتر دووچارمان دەبێت، واتە بەو هۆکارانەی لە سەرما و گەرما و گۆڕانیی کەشوهەوا و هۆکاری دیکەوە پەیدا دەبن و ئەمەش چەندە ئاسمانیی و خواییە، ئەوەندەش مرۆیی و ژینگەیی. بۆیە نابێت مرۆڤ هەندێ نەخۆشی زیاتر وەک بەڵا و نەخۆشیی خودایی تەماشا بکات لەچاو هەندێکیترياندا.. هەموو شتێک هۆکار و هەلومەرجی سرووشتیی و هێزی تایبەتیی خۆی هەیە، بۆیە هیچ شتێک نییە شیاوی شیکردنەوە و ڕوونکردنەوە نەبێت و بەتەواوی ئەفسانەیی بێت)** (Fabricus: ١٩٦٥, p: ٧٧).

٢. جەستە و تەنی مرۆڤ بەشێکە لە جەستە و تەنی جیهان و سرووشت بە گشتی. بۆیە پێویستە لە چارەسەرکردندا توانا تایبەتییەکانی جەستە بۆ زاڵبوون و ڕزگاربوون لە نەخۆشیی لەبەر چاو بگیرێن. وەک دەبینین ئەم پرانسیپە ڕەنگدانەوەی بڕوای یۆنانییەکانە بە بوونی هارمۆنی و هاوسەنگیی لە نێوان هێزە سرووشتی و گەردوونیەکاندا. (Fabricus, Ibid., p: ٧٧)

٣. پیشەی پزیشک بریتیە لە تێگەیشتن لە ڕاستەقینەی ژیان، کە خۆشبەختییە و بەرزترین ئامانجیش لە ژیاندا بریتیە لە تەندروستی.

٤. باشترین جۆری تێگەیشتن لە ژیان ئەوەیانە کە پشت بەستوو بێت بە تێگەیشتنی فەلسەفیی و ئەقڵانی لەم بوارەدا..

٥. چونکە تێگەیشتنی ئەقڵانی، کە پزیشکەکان بە تواناترین کەسانن لەم بوارەدا، بەشێکە لە تێگەیشتنیان لە ژیان بە شێوەیەکی گشتی.. (لیندبرگ، ص: ١٥٨، ئیبن رضوان، ص: ٢٨٨)
٦. لە ئەنجامدا، بەلای هیپۆکراتیسەوە پزیشکەکان ئامۆژگاریکەر و ڕێنماییکەری مرۆڤن بەرەو خۆشبەختی..

لەم میانەیەشدا هیپۆکراتیس و پەیڕەوکارانی، پیشەی پزیشکی دەبەستنەوە بە سێ کاری سەرەکییەوە:

**چاکە:**

چاکە جەوهەرێکی کردارییە و کاری چاکەش دیسانەوە چاکەی دیکەی بەدوادا دێت. بەم مانایەش، لە چاکەکردن، بۆ نمونە چاککردنەوەی مرۆڤ لە نەخۆشی، تەنیا چاکەی لێدەکەوێتەوە، چونکە مرۆڤ لە دۆخی تەندروستی ئەقڵیی و جەستەییدا بیر لە بەرژەوەندییەکانی خۆی و هاوڕەگەزەکانی دەکاتەوە و خزمەت بە هاوڕەگەزەکانی دەکات. ئەو پزیشکەی نەخۆشێک چاکدەکاتەوە، ناڕاستەوخۆ خزمەت بە فراوانکردنی ڕەهەندیی چاکە لە ژیاندا دەکات. چونکە کاتێ ئەو نەخۆشە لە دەرد و ئازاریی نەخۆشییەکەی ڕزگاری دەبێت، بەپێی سرووشتی خۆی چاکەکارە.

**دادوەری:**

چونکە چاکەکردن بۆخۆی جۆرێکە لە هێنانەدی دادەوەری. پیشەی پزیشکی بەوەی کە نمونە بەرزەکەی لە پرۆسەی کاری خۆیدا ساخڵەمی و تەندروستی و گێرانەوەی مرۆڤە لە

دۆخیی ناهارمۆنییەوە بۆ دۆخیی سروشتیی و ئاسایی، کە هیچ جۆرە دەرد و نەخۆشییەک نەبێتە هەڕەشە بەسەر ژیانییەوە، ئەوە پیشەیەکە لە هێنانەدیی دادوەریدا، بەتایبەتی دادوەریی لە ڕەخساندنی مافی چوونیەکی ژیانێکی ساخڵەم بۆ هەمووان، کارگەریی و بەشدارییەکی باڵای هەیە.

**جوانی:**

هەر جۆرە وەدیهێنانێکی دادوەریی بریتیە لە هێنانەکایەی جوانیی و هارمۆنی و گونجان و تەبایی.. لەبەر ئەوەی هارمۆنی بەشێکی جیانەکراوەیە لە جەستەیەکی ساخ و دروست. ئەو جەستەیەی نەخۆشدەکەوێت، هارمۆنیی خۆی لەدەست دەدات و ناعەدالەتی فەرمانڕەوایی بەسەردا دەکات. کەواتە پیشەی پزیشکی ڕۆح و جەستەی مرۆڤ لە ناعەدالەتیی و ناهارمۆنیی ڕزگار دەکات و تواناکانی مرۆڤ دەگێڕێتەوە سەر دۆخی سرووشتیی خۆیان، کە توانایەتی بۆ داهێنان و خۆدروستکردن و چاکەکاری. هەر لەبەر ئەو گرنگیی و بەشدارییەی پیشەی پزیشکیشە لە ژیانی مرۆڤدا، کە هیپۆکراتیس گوتویەتی:

> **(هیچ شتێ لە جیهاندا نییە شایانی ئەوە بێت وەک دەستخۆشانە و پاداشت بدرێتە پزیشک، چونکە لەشساخیی و تەندروستی شتێکن بەبێ ئەوان ژیان مەیسەر نابێت و مرۆڤ بەبێ تەندروستی ناتوانێ هیچکارێک ئەنجام بدات. بۆیە ڕزگاربوون لە نەخۆشی، لە ڕاستیدا**

**ڕزگاربوونە لە مەرگ). (ئیبن ڕەزوان: بەشی سێیەم، ل: ٢٨٦)**

**مەرجەکانی هیپۆکراتیس**
**بۆ کاری پزیشکیی ڕەسەن:**

لەئەنجامی خوێندنەوەی ***سوێندنامە***کەی هیپۆکراتیسەوە، کە کۆنترین دەقی پزیشکیە لە مێژووی ئەم زانستەدا، حەوت خەسڵەتی سەرەکیی پزیشکیی ڕەسەنمان دەست دەکەوێت، کە هەموویان بە ئاراستەی نەخۆشناسی و ڕەچاوکردنی مافەکانی نەخۆش و چارەسازیدان. لە سەرەتاوە دەقی سوێندنامەکەی هیپۆکراتیس دەخەینە پێشچاو و لە پاشتریش بنەما ئاکارییەکانی بەرجەستە دەکەین:

دەقی سوێندنامەکەی هیپۆکراتیس:

**(من سوێند بە خواوەندانی هونەری پزیشکی: ئاپۆڵۆن، ئاسکیلیپۆس، هیژیا و پاناکیا و گشت خواوەندانی نێرینەو مێینەی تر دەخۆم و گشتیان دەکەمە شایەت کە لە سنووری توانای خۆم و بەپێی داوەریکردنی خۆم، ئەم سوێندنامەیە بگرمە ئەستۆم و جێبەجێی بکەم:**

**من ئەم سوێندنامەیە و پەیمان (کۆنتراکت)ی نووسراو، وەکو خۆی جێبەجێ دەکەم. سوێند دەخۆم ئەو کەسەی فێری پیشەی پزیشکیم دەکات وەک باوانی خۆم تەماشا بکەم و لەکاتێکدا پێویستیی پێی هەبێت، قووت و**

دەرامەتی خۆمی لەگەڵ بەشکەم و پێویستییەکانی دابین بکەم.

*کورەکانی وەک برای خۆم تەماشا بکەم و لەکاتێکدا بیانەوێ لە بواری پزیشکیدا بخوێنن، بەبێ گرێبەست و پارە، فێری پیشەی پزیشکییان بکەم.*

سوێند دەخۆم، کە بنەما گشتیەکان، وانە زارەکیەکان و گشت زانیارییە پزیشکیەکان، جگە لە کورەکانی خۆم و کوری مامۆستاکەم و ئەو قوتابیانەی کە بەپێی یاسای پزیشکی قەبوولکراون و سوێندیان خواردووە، فێری کەسیی تر نەکەم.

بەپێی توانا و داوەریکردنم، پارێز لە بەرژەوەندیی نەخۆشەکانم، دادەنێم و هیچکاتیش نە لەسەر دوای کەسانێک و نە بۆ زیانگەیاندن بە نەخۆشەکانم، دەوای کوشندە بەکەس نادەم و ئامۆژگاریی کەسیش ناکەم ئەو کارە بکات.

هەروەها ئامرازیی لەباربردنی منداڵ ناخەمە بەردەست هیچ ژنێک، بەڵکو بەهۆی پاکژیی و ڕێزگرتن لە پیرۆزیی ژیان، پیشەکەی خۆم و ڕەگەزەکەم دەپارێزم.

نەشتەرگەریی ئەو نەخۆشانەی بەردیان هەیە ناکەم و ئەم کارە بە کەسێکی شارەزا دەسپێرم.

سوێند دەخۆم، پێ بخەمە هەرماڵێکەوە، لە پێناوی سوودگەیاندن بە بارودۆخی نەخۆشەکان بێت و خۆم لەهەر کارێکی ناشایستە، بەتایبەتی کاری چێژبەخش

**لەگەڵ ژنان، یان پیاوان، ئازادبن یان کۆیلە، بەدوور بگرم.**

**سوێند دەخۆم، ئەوەی لەکاتی ئەنجامدانی پیشەکەم و دوایئەوەش، لەسەر ژیانی تایبەتی خەڵک دەیبینم، یان دەیبیستم، ئاشکرا ناکەم و بەکەسی ناڵێم، چونکە دەبێت ئەمجۆرە شتانە بخرێنە گەنجینەی نهێنییەکانەوە.**

**ئەگەر هەموو ئەم سوێندنامەیەم جێبەجێ کرد و شانازیم پێوە کرد، ئەوە لەبەرهەمەکانی ژیانی خۆم سوودمەند بم و هەردەم لە ناو خەڵکدا شانازیی بەخۆمەوە بکەم و سەربەرز بم. بەڵام ئەگەر لە ئاستیدا کەمتەرخەم بووم و کارم بە سوێندەکە نەکرد، ئەوە سوودمەند نەبم لە بەرهەمەکانی ژیان و پیشەکەم و هەمیشە لە نێو خەڵکدا سەرشۆڕ و شەرمەزار بم).** (Fabricus )

.*ww.wikipedia.com*: ١٩٦٥, p: ٧٨-٧٩

ئەوەی لەم سوێندنامەیەدا، لە ڕووی فەلسەفییەوە گرنگە، ئەو بۆچوونە مرۆڤدۆستانەیەیە کە پەیوەستیی کردۆتەوە بە ئاکاری پزیشکیی و پیشەزانستیەکەیەوە. هیپۆکراتیس لەم دەقەدا، بنەماکانیی ئاکاریی پزیشکی و تەنانەت مافەکانی نەخۆشیش دادەڕێژێت. ئەمە جگە لەوەی ئەم تێکستە ئاشکراکەری دابڕانێکە لە دیدی یۆنانییەکاندا، لە دیدێکەوە کە تیایدا هزری ئایینیی و ئەفسانەیی بەسەر لێکدانەوەکانیاندا باڵادەست بوو، بۆ دیدێکی سرووشتیی و هۆکارمەندی ژیرانە.

هیپۆکراتیس بەم قسانەی ڕوانگە و بۆچوونی جادوویی لە پیشەی پزیشکیدا وەلاوە دەنێت و ترسیی مرۆڤ لە خورافەپەرستیی نەریتخوازانە دەڕەوێنێتەوە، بەبێ ئەوەی بە پێویست لە دژی باوەڕیی ئایینی بوەستێتەوە.
ئێمە بەمجۆرەی خوارەوە، ئەو بنەمایانە و خاڵە گرنگانە لێکتر جیادەکەینەوە، کە لەم تێکستە مێژووییەدا بەرجەستە بوون:
**یەکەم:** دانانی خودا و خواوەندەکان و هێزیی باڵا وەک چاودێریکەر و شایەت بەسەر پیشەکەیەوە. ئەمەش گوزارشتە لەو پشتیوانە باڵایەی کە پزیشک دەیکاتە سەرچاوەی سەرکەوتن و پشتیوانی و چاودێریکەریی پیشەکەی خۆی.
**دووەم:** وەفاداریی لە ئاست مامۆستا و پەروەردەکەراندا و پیشاندانی ڕێز و ئەمەگداریی لە ئاست ئەو ڕابردووەی پزیشک بە مامۆستاکانییەوە دەبەستێتەوە.
**سێیەم:** ڕەچاوکردنی مەرجی ئاکاریی لە پیشەکەیدا، بە پێنەدانی دەرمانی کوشندە و لەباربەر بە نەخۆش، یان هەر کەسێکیتر.. ئەم مەرجە ڕێدەگرێ لەوەی پزیشک بکەوێتە ژێر کاریگەریی نەخۆش و پەیوەندییە نەسەبیی (خوێنی) و هۆکارییەکانەوە، یان سوود وەرگرتنی مادیی و ڕیشوەخۆرانە لە دەرمان بۆ مەبەستی نامرۆڤانە.. ئەوەی کە لە زمانی ئەمرۆدا پێیدەگوترێ واسیتە و بازرگانی و فرۆشتنەوەی دەرمانیی ئێکسپایەر بە هاوولاتیان..
**چوارەم:** ئەنجامدان و جێبەجێکردنی ئەرکەکان لە چوارچێوەی شارەزایی و پسپۆڕییدا و ڕێزگرتن لە سنووری پسپۆڕیی

ئەوانیتر و بەشداریی پێکردینان بەپێی جیاوازیی پسپۆڕیی لە بواری پزیشکیدا.. ئەم مەرجە پێمان دەڵێت، کە هەر پسپۆڕییەک سنووری دانایی خۆی هەیە و ناکرێ کەسێک لە بوارێکدا پسپۆڕ و شارەزای گشت بوارە زانستیەکانیتر بێت و کایە زانستییەکان پێویستییان بە تێکەڵیی و هاوکاریی یەکتر هەیە. بۆیە هاوکاریی و ڕاوێژ لە نێو پزیشکەکاندا بەشێکە لە ئاکاریی پیشەیی و دابینکردنی سەرکەوتن لە بواری پراکتیکیدا.

**پێنجەم:** نرخاندنی پرسوڕاگۆڕینەوە لە بواری هونەری پیشەکەیدا و نەکردنی کاری سەربەخۆ و نابەرپرسیارانە. چونکە ڕاستەقینەی زانستیی، کاری یەک بواری پسپۆڕیی نییە و پێویستە هەر بڕیارێک بیروڕای دەستەیەک لە زانایانی لەسەر وەربگیرێ و لە زانستدا خۆ لە کاری تاکڕەوانە بەدوور بگیرێت..

**شەشەم:** ئەنجام نەدانی کاری نەشیاو و پێچەوانەی ئاکار و ڕەچاوکردنی ئەمانەتداریی و لەبەرچاونەگرتنی بەرژەوەندیی تایبەت لە پێناوی چێژی جەستەییدا. بەم مانایەش، پزیشک لە کاتی ئەنجامدانی پیشەکەیدا ڕەچاوی بنەما تیۆریی و پسپۆڕییەکەی خۆی دەکات، نەک بەدوای تێرکردن و وەڵامدانەوەی تەماع و غەریزە مرۆییەکانی خۆیدا بڕوات و لە پێگەی پزیشکیدا داوێنپیسی بکات. پسپۆڕیی بەرپرسیارێتیە و پێویستە لە هەر کارێکی پیشەییشدا ئاکاریی پیشەیی لەبەرچاو بگرین.

**حەوتەم:** پاراستنی نهێنیی نەخۆشەکان لەلایەن پزیشکەوە. چونکە پزیشک بۆ نەخۆش جێی ڕاز و نهێنییە و پیشەی پزیشکی، کەسایەتیی پزیشکیی پسپۆڕ دەروەست دەکات لە ئاست ئەو نهێنیانەدا، کە پێویستە پزیشک لە زمان نەخۆشەکەوە بیانزانێت، یان ئەو شتانەی لەکاتی نەخۆشبوونەکەیدا ڕوودەدەن، دەبێت پارێزراو بن. (محسنی: ۲۰۰۳، ل: ۲٤۳)

# ئەنجام و پێشنیازەکان

**ئەنجامەکان:**

دوای ئەم توێژینەوەیە و بۆ ڕێخۆشکردن سەبارەت بە خستنەڕووی چەند ڕێنمایی و ئەنجامێکی کردەکی، دەمەوێت لە ڕێگەی پرسیارێکەوە، بەشی کۆتایی باسەکەم بخەمە ڕوو:

**بۆچی پێویستە پزیشک ڕێز لە نەخۆش بگرێت و پەیوەندییەکی ڕێزدارانەی لەگەڵ ببەستێ؟**

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە و گەڵاڵەکردنی ئەنجامەکانی ئەم باسە، باس لە (٤) هۆکاری بنەڕەتیی دەکەین، کە بەهۆی ڕەچاوکردنیانەوە، سەر لە نوێ زانست و پیشە و هونەری پزیشکی، پەیوەندیی خۆیان لەگەڵ فەلسەفە، وەک جۆرێکی بیرکردنەوە لە مرۆڤ و دۆخەکانی مرۆڤبوون، پتەو دەکەنەوە و ئەو دابڕانەی ڕویداوە لە نێوانیاندا، پڕ دەکرێتەوە. ئەمەش دەبێتە هۆی گۆڕانکاریی لە ڕوانینی پسپۆڕیانەی پزیشک و بچووک نەکردنەوەی مرۆڤ لە دۆخی نەخۆشبوونیدا. ئەمە جگە لەوەی بەهۆی ئەمکارەوە، گرنگیی بە سەرهەڵدانی ڕۆشنبیرییەکی فەلسەفیانە دەدرێت لە پیشەی پزیشکیدا، کە بەهۆیەوە، تێگەیشتنێکی فراوانتر و ڕیشەییتر لە نەخۆش، لەسەر بنەمای مرۆڤبوونەکەیەوە، دروست دەبێت، کە پێویستییەکی ئەمڕۆی کۆمەڵگەی ئێمەیە.

کەواتە وەڵامی ئێمە بۆ ئەو پرسیارەی سەرەوە، کە بۆچی پێویستە پزیشک ڕێز لە نەخۆش بگرێت، لەسەر ئەم هۆکارانەوە دامەزراوە:

**یەکەم:** ئەم ڕێزگرتنە دەگەڕێتەوە بۆ سرووشتی نەخۆشخانە، کە لەسەرەتاوە بە (میوانخانەی خودا = Hotel-Dieu) ناودەبرا. بەمجۆرەش وشەی (هۆسپیتاڵ)ی ئەمڕۆ، لە مێژووی خۆیدا پەیوەستە بە میوانداریی و داڵدەدان و هاوکاریی و دەستگیرۆییەوە، ئەمەش پێیدەگوترێ: (هۆسپیتاڵیتی) (محسنی: ٢٠٠٣، ل:٢٦٤).
هۆسپیتاڵیتی ئەو هەڵوێست و ڕێزەیە کە سیستەمێکی تەندروستیی، یان یەکە تەندروستییەکانی ناو سیستەمی تەندروستی وڵاتێک، لە ژێر کاریگەریی تێگەیشتنێکی تایبەت لە مرۆڤ، لە نەخۆشی دەگرن، بۆ ئەوەی ئەم مرۆڤە هەست نەکات مافی مەعنەویی لەبەر دۆخیی نەخۆشبوونەکەی، کە ئەوی خستۆتە ناو ناهاوسەنگییەکی خۆنەویستەوە، پێشێل دەکرێت.

**دووەم:** نەخۆش وەک ***مرۆڤ*** لە هەموو شوێن و کاتێکدا مافی هەیە ڕیزی لێبگیرێت و داڵدەی بدرێت، چونکە مرۆڤ خاوەنی کەرامەتە و کەرامەت لە مرۆڤدا پیرۆزیی خۆی هەیە.

**سێیەم:** مرۆڤ لە کاتی نەخۆشیدا ***مافی تایبەتی*** هەیە کە دۆخی نەخۆشبوونەکەی پێیدەبەخشێت و ئەویش خۆی لە ڕەچاوکردنی کۆمەڵێ خاڵدا دەبینێتەوە، وەک بەتەنگەوەهاتن،

وەلامدانەوە، ڕێزگرتن و خەمخۆریی و بەهاناوەچوون. (بڕوانە: ئەکێ لۆڤە شلیدال: ٢٠١١، ل: ٢٧٣٢، پەرەگرافی ٢٥، جاڕنامەی گەردوونیی مافی مرۆڤ).

**چوارەم:** سرووشتی پیشەی پزیشکی، لەبەر ئەوەی لەسەر بنەمای زانایی پزیشک بە نهێنیەکانی نەخۆش، بەهۆی نزیکبوونەوەی زۆریان لەیەکتر، لەبەر ئەو چاوەڕوانیانەی نەخۆش لە پزیشکی هەیە و ئومێدی چاکبوونەوەی خۆیان لەسەرەوە هەڵدەچنێ، جۆرێ لە ڕێزگرتن لە نەخۆش دەسەپێنێ و متمانەی نەخۆش و پزیشک پتەو دەکات.
لە کۆتاییشدا پێویستە پزیشک ئەوەش بزانێت کە پیشەکەی ئەو دەخاتە پێگەیەکی کۆمەلایەتیی و کولتووریی ئەوتۆوە، کە مرۆڤ لە پێگەی نەخۆشدا وەک نمونەیەکی بەرزی ئەخلاقیی و تەگبیرکەرێکی ژیان، کە بەردەوامیی ئەوی بەدەستە، لێیدەڕوانێت.. لە دەستدانی ئەم پێگەیە و ئاگادارنەبوون لێی، ڕێگریی لەبەردەم چارەسەر و هاوکاریی نەخۆشدا دادەنێت و نەخۆش وەکو پێویست هاوکار نابێت بۆ ئەوەی پزیشک سەرکەوتن بەدەست بهێنێت. خوێندنی پزیشکی لە وڵاتی ئێمەدا لەسەر بنەمایەکی دیموکراسی و تاکباوەڕییەوە بینا نەکراوە، بۆیە پزیشکەکانی ئێمە لە زۆربەی کاتدا، دیموکراسیانە و لە ڕوانگەی ڕێزگرتن لە نەخۆش وەک تاکەکەسێک ڕەفتار ناکەن و جۆرێ لە لووتبەرزی و باڵانۆڕییان تێدایە، بەتایبەتی ئەوانەیان کە لە ناوخۆی وڵات خوێندنیان تەواو کردووە. ڕێنمایی دروست بۆ ئەم جۆرە پزیشکانە، کە پیشەکەی دەسەڵات و پێگەی داوەتێ، پێویستە بیر لەوە بکەنەوە

پیشەکەیان بکەنە پەیوەندی نەگ پێگەیی.. دکتۆر و نەخۆش وەک قوتابی و مامۆستا وان، هەتا مەودای مرۆیی و هاوڕێیەتی لە نێواندا هەبێت، ئەنجامەکەی بۆ هەردوو لا بەسوودتر دەبێت..

## پێشنیازەکان

بە لەبەرچاوگرتنی باس و بەشەکانی ئەم توێژینەوەیە، هەروەها بە لەبەرچاوگرتنی ئەو واقیعیەی تیایدا دەژین و چاوەڕوانیەکانمان لە داهاتوو، ئەمە جگە لەو ئامانجانەی کە پێویستە بۆ سەرکەوتنی کۆمەڵگەیەک لە ژیانی تەندروستیی و ڕۆحیی و جەستەیی خۆیدا، لەبەر چاوی بگرین، چەند پێشنیازێک بۆ لایەنە پەیوەندارەکان دەخەمە ڕوو بۆ ئەوەی هەر هیچ نەبێت بەشدارییەکی بچووکمان کردبێت بە ئاراستەی هووشیاریی ئاکاریی پزیشکیی و هاندانی پزیشکەکان تا وەک هاونیشتمانی لە نەخۆشەکانیان بڕوانن. ئەم خاڵانەی لێرەدا دەخرێنە ڕوو، کۆی ئەو خاڵانە نین کە پێویستە باس بکرێن، بەڵام وەک دەستپێکردن و سەرەتایەک، خاڵیی گرنگن و پێویستە کاریان بۆ بکرێت:

١. پێویستە لە بنەماکانی سیستەمی تەندروستیی وڵاتدا گرنگیی بە هووشیاریی مافەکانی نەخۆش و نەخۆشناسیی بدرێت و ئەو ڕێنماییانە بەرجەستە بکرێن، کە لە ڕێگەیانەوە نەخۆش هەستدەکات لەلایەن کاگوزارانی سیستەمەکەوە لە ئاستی (یاسایی و جێبەجێکردن) گرنگیان پێدراوە و ڕەچاو دەکرێن. پێویستە سیستەمەکە ئەو ڕۆحییەتە پەرەپێدات کە

ئاشکرای دەکات، ڕیزگرتن لە نەخۆش و تێگەیشتن لێی، بەشێکی گرنگیی چارەسەرکردن و چارەسازیە و مافێکی یاسایی خۆیەتی. بۆیە بە ستانداردکردنی مافەکانی نەخۆش و جێکردنەوەیان لە چوارچێوەی یاسایەکی تایبەتدا بەشێکە لە نوێکردنەوەی سیستەمی تەندروستیمان و بەرزکردنەوەی بۆ ئاستێکی باش لە ناوچەکە و جیهاندا.

٢. پێویستە دەموودەست وانەی ئاکاریی پزیشکی و نەخۆشناسی، وەک دوو یەکەی سەرەکیی خوێندنی پزیشکیی و پەرستاریی و ئاستەکانی دیکەی ئەم پسپۆڕییە لە بەشە زانستیەکاندا بخوێندرێن و لەلایەن پسپۆڕانەوە بگوترێنەوە و ئەو سەرچاوە و کەرەستانە بۆ وانەکە دابین بکرێن، کە بنەما تیۆریی و کردەییەکان فێریی قوتابییە پزیشکەکان و پەرستاران و ئەوانیتر دەکات. ئەم وانەیە لە ئێستادا یا هەر لادراوە، یان خراوەتە پەراوێزەوە و لە زۆربەی بەشە پزیشکیەکانیشدا لەلایەن پسپۆڕانی بواری فەلسەفەوە ناگوترێنەوە و ماوەی وانەکەش ئەو بۆشاییە گەورەیە پڕ ناکاتەوە، کە لە پشتگوێخستنی وانەکەدا لە دانایی پزیشکان و کارگوزرانی دیکەی سیستەمەکەدا دروستدەبێت.

٣. پێویستە ساڵانە خولی تایبەت سەبارەت بە مافەکانی مرۆڤ، بە مافەکانی نەخۆش و نەخۆشناسیی پراکتیکی بۆ پزیشکە خولاوەکان و کارمەندانی دیکەی سیستەمی تەندروستی، کە سەروکاریی ڕاستەوخۆیان

لەگەڵ نەخۆشەکان هەیە، بکرێتەوە. پێویستە ئەم کارمەندانە هەر لە پاسەوانەکانی پرسگەوە، تا بەرێوەبەریی ئیداریی نەخۆشخانەکان بگرێتەوە و بەو زانیاریانە دەوڵەمەند بکرێن، کە برێکی زۆر لە ڕازیبکردنیی هاوڵاتیان و پیشەکەیان بۆ دابین دەکات. ئامانجیی ئەو خولانە پێویستە هاندانیان بێت بۆ بەردەوام بوون لەسەر پیشەکەیان و بەرجەستەکردنی گرنگیی ئەو پسپۆڕییە و ئەو ئەرکە ئاکاریانەی دەکەوێتە سەرشانیان.

٤. پێویستە سیستەمی تەندروستیی گرنگیی بە پزیشکە سەرکەوتووەکان بدات کە لە ئەنجامدانی ئەرکەکانیاندا و بە ئاستێکی بەرزی کۆنترۆڵیی جۆری، مامەڵە لەگەڵ نەخۆشدا دەکەن. ئاسانکاریی و دەسەڵاتدان و ڕێزلێنان لەمجۆرە پزیشکانە برێکی زۆر سەرکەوتن و ڕەزامەندیی و متمانەی کۆمەڵگەی نەخۆشەکان، بە پسپۆڕیی پزیشکیی ناوخۆیی دەباتە سەرێ و چیتر نەخۆش، چوونە دەرەوە بۆ وڵاتانی تر بە تەنیا کلیلی چارەسەر نازانیت.

٥. پێویستە سیستەمی تەندروستی وەک بەرزترین دەسەڵاتی تەندروستی بە هاوکاریی وەزارەتیی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی لە وڵاتدا، چاودێریی نەوعیی لە بواری ئاکاری پزیشکی و نەخۆشناسیی و مافەکانی نەخۆشدا، بخاتە سەر پسپۆڕانی زانکۆ و پەیمانگا و نەخۆشخانە تایبەتی و ئەهلییەکان و بەرنامەیەکی ستاندارد گەڵاڵە بکرێت بۆ

یەکدەستکردنی ئەو زانیاریانەی کە یەکدەنگیی و تێگەیشتنێکی هەمە لایەن لە مافەکانی نەخۆش و ئاکاریی پزیشکی بەرهەم دەهێنن.

٦. گرنگە وەزارەتیی تەندروستی و سەندیکای پزیشکانی کوردستان، بە هاوکاریی و گەیشتنە ئەنجام لەگەڵ وەزارەتی پەروەردە، وانەی نەخۆشناسی و مافەکانی نەخۆش و ئاکاری پزیشکی، لە دووتوێی نامیلکەیەکدا بۆ قوتابیانی بنەڕەتی، ئامادە بکەن و هەر لەو قۆناغە هەستیارەوە مرۆڤی ئەم کۆمەڵگەیە ئاشنا بکرێت بەو مافانە و دروستکردنی ڕۆحیی زانسیی و ئاکاریی پیشەیی.

٧. کولتووری دژایەتیی و کێبڕکێی دەروونی لە نێوان دکتۆر و کارگوزارانی نەخۆشخانەکاندا بنەبڕ بکرێت و لیژنەکانی تەندروستی بەشێوەیەکی دادوەرانە مامەڵە لەگەڵ پزیشکەکاندا بکەن و لێکدانەوەی ئادیۆلۆژی و سیاسی بۆ پیشەی پزیشکی نەکرێت.

٨. پێویستە بە گرنگییەوە لە میدیاکاندا پزیشکە داهێنەر و کارامەکانی ئێمە باسیان بکرێت و هەست بە شانازیی بە پیشە و کارەکانیانەوە بکەن، هەروەها حکومەت هاندەرانە و پشتگیرانە پزیشکە سەرکەوتووەکان ڕێز لێبنێت.

## له مافه‌كانی نه‌خۆشه‌وه بۆ ئه‌ركی نه‌خۆش و مافه‌كانی پزیشك.

ئه‌و قوربانیانه‌ی میلله‌تی ئێمه له پێناوی ئێستادا به‌خشیونی، ئه‌وه ده‌هێنن كه سیسته‌مێكی ته‌ندرستی نمونه‌یی و ئاكارناسییه‌كی پزیشكیی و نه‌وعیمان هه‌بێت و ئه‌و نائومێدییه‌ی كێشه‌كانی ژیان و پاشماوه‌ی به‌كارهێنانی چه‌كی كۆكوژیی و كیمیایی و جینۆساید له هه‌رێمه‌كه‌ماندا به‌سه‌ر مرۆڤی ئێمه‌یدا سه‌پاندووه، به ئاكاریی پیشه‌یی و میهره‌بانیی پزیشكه‌كان له‌گه‌ڵ نه‌خۆشه هاوزمان و هاوشارییه‌كانیان باربوو و قه‌ره‌بوو بكرێته‌وه. ئه‌مه جگه له‌وه‌ی پێویسته كه‌رتی تایبه‌ت و حكومه‌ت هیچ سڵ نه‌كه‌نه‌وه له مۆدێرنیزه‌كردنی زانستیی و دابینكردنی پێشكه‌وتووترین ئامێر و پسۆڕیی وه‌ك به‌شێك پێشگیریی و ڕێگریی له‌و كێشانه‌ی كه بۆیان هه‌یه له داهاتوودا یه‌خه‌مان بگرن.

من دڵنیام هه‌ر كات پزیشكه به‌ڕێزه‌كانمان هووشیاریی نه‌ته‌وه‌یی و مێژووییان سه‌باره‌ت به كوردبوون و ئه‌و مێژووه سه‌پاوه، گه‌یشته ئاستێك كه له تراژیدیای نه‌خۆشی ئه‌م وڵاته و زیانپێگه‌یشتووان و قوربانی و بریندااران و په‌ككه‌وته و ده‌ست و قاچ بڕاوه‌كانی جه‌نگ و دایكانی جگه‌رسوتاو و هه‌زاران قوربانیی تر، به‌جۆرێكی تر ببینن، ئه‌وكاته پێویستیی به فه‌لسه‌فه‌ی ئاكاریی پزیشكی له كاری پیشه‌یی ئه‌واندا ڕووخساری ڕاسته‌قینه‌ی خۆی ئاشكرا ده‌كات.. ئه‌و ساته‌وه‌ختـه به‌ڕێوه‌یه كه پزیشكی پیشه‌یی سه‌ركه‌وتنی خۆی نه‌ك ته‌نیا له‌و بڕه زانسته‌دا ببینێت، كه فێری بووه و تاقیكردۆته‌وه، به‌ڵكو له‌و ڕه‌زامه‌ندیی و متمانه‌یه‌شدا ببینێته‌وه

کە نەخۆشەکان پێی دەبەخشن. ئەمە ئەو ساتەوەختە دەبێت کە فەلسەفەی ئاکاری پزیشکی بەرجەستە دەبێت و پزیشک لە کەسێکی پسپۆڕەوە بەرز دەبێتەوە بۆ هێزێکی میهرەبان و شفابەخشی بێ نمونە، کە ئومێد بەشێکی گرنگ دەبێت لە زانست و پیشەکەیی و پزیشکیی وەک ئاستێکی هونەری خۆی بەرجەستە دەکات..

هاوکات بەمە، پێویستە لە کۆتایی ئەم باسەدا دوو خاڵی گرنگ بەبیر بهێنینەوە:

یەکەمیان پەیوەندیی هەیە بە مافی پزیشک و دووەمیان پەیوەندیی هەیە بە ئەرکی نەخۆشەوە.

ئاکاریی پزیشکیی دابڕ نییە لە قسەکردن لەسەر ماف و ئاسایشی ژیانەکیی پزیشکەکان. فەلسەفەی ئاکاریی پزیشکی چەندە قسەکردنە لەسەر مافەکانی نەخۆش، ئەوەندەش بەرجەستەکردنی ڕۆڵی مرۆییانەی پزیشکە لە کۆمەڵگەدا. بۆیە ئەگەر بەدیوێکدا ئاکاریی پزیشکی دۆزینەوەی ئەو پەیوەندییە هەستیارەی نێوان پیشەی پزیشکیی و نەخۆشە مرۆڤ بێت، ئەوە بە دیوەکەی تردا ڕوونکردنەوەی پیشەی پزیشکیی و پێویستیی تاکەکانی کۆمەڵگەیە بەم پیشەیە و بە پزیشکەکان. لێرەشدا قسەکردن لەسەر ماف و ئاساییشی ژیانەکیی پزیشکەکان وەک نەگوتراویک دەمێنیتەوە لەپشت هەر داکۆکیکردنێک لە مافەکانی نەخۆش. لە ڕاستیدا پیشە و خوێندنی پزیشکی، بەشێکی زۆر لە تەمەن و ژیانی پزیشک دەکاتە قوربانیی و ڕەنگە لە زۆرێک لەو قۆناغانەی کە

هەرکەسێکی ئاسایی پێیاندا تێپەڕ دەبێت، دوا بخات کە قەرەبووکردنەوەیان تەنیا بەوە نابێت مرۆڤ بڕوانامەی پزیشکیی بەدەست بهێنێت.

لەبەر ئەوە پێویستە لە پاڵ ئەرکەکانی پزیشکدا باسی مافەکانیشیی بکرێت و لە ئاستێکی یاساییدا ئەو دڵنیاییانە بە کەسی پزیشک ببەخشرێت، کە ڕێی لێدەگرن تا ژیانی خۆی وەک بە فێڕوادانێک لێکبداتەوە. دەکرێ ئەم مافانە هەندێکیان مادیی و ماتەریاڵیی بن و دەکرێ هەندێکیشیان مەعنەوی و ڕۆحیی بن. لێرەشدا یەکەم جۆری ئەم مافە مەعنەوی و ڕۆحییانە بەوە دەست پێدەکات، کە ئاستی هوشیاریی هاووڵاتیان و نەخۆشەکان ببەینە سەرێ بە جۆرێ کە چوارچێوەی پزیشکناسی و کەسایەتی پزیشکیش وەک مرۆڤێکی ئاسایی بگرێتەوە.

ئەوە ڕاستە بەو جۆرەی کە باس لە مافەکانی نەخۆش دەکەین، ناتوانین باسی ئەرکەکانی بکەین، ئەمەش لەبەر دوو هۆکار: یەکەمیان پەیوەندیی هەیە بە جۆر و ڕادەی نەخۆشییەوە کە وا دەکات چاوپۆشیی بکرێت لە زۆر لە ئەرکەکانی نەخۆش، یان لە هەموویان. دووەمیشیان پەیوەندیی هەیە بەو ڕاستییەوە کە دەڵێت: نەخۆش بۆخۆی بەرپرسیار نییە لە نەخۆشکەوتن و چاکبوونەوەی. نەخۆش بۆخۆی بە ویستی خۆی نەخۆش ناکەوێت و بەدشانسییەک ئەو دەکاتە قوربانیی نەخۆشکەوتن (لامبوس، ل: ٧٤٧). بوونی ماف و ئەرک بۆ نەخۆش، لە هەمان کاتدا، وەک ناکۆکێک دێتە پێشچاو، چونکە کاتێ مرۆڤ، بە (نەخۆش) پێناسە دەکەین، ئەرکی لە ئاست کەسیتردا، جگە لە

خۆی لە سنووری تواناییدا، لەسەر نامێنێت. پێویست لەم دۆخەدا نەخۆش ڕێنمایی بکرێ، یارمەتی بدرێت و هەرچی زووتر لەو بارودۆخە بهێنرێتە دەرەوە، کە نەخۆشبوونەکەیەتی. بۆیە لە ڕووی ئیتیکییەوە، پێویستە هەر جۆرە قسەوباسێک لەمبارەیەوە، تەنیا مافەکانی نەخۆش بگرێتە خۆی.

لەگەڵ ئەوەشدا نەخۆش بە پلەی یەکەم، پێویستی بەوەیە بەوجۆرە تەماشای نەخۆشبوونەکەی خۆی بکات، کە بارێکی نەویستراوە و پێویستە خەبات بکات بۆ ئەوەی بە زووترین کات خۆی لەدەست ڕزگار بکات. بە پلەی دووەمیش پێویستە نەخۆش هاوکار بێت لەگەڵ ئەو توانایی و خزمەتگوزارییە پسپۆڕانەی کە چاکبوونەوەکەی بۆ ئاسان دەکەن و خۆی لە بەرامبەریاندا وەک داواکارێک ببینێت، کە پێویستیی پێیان هەیە. پێویستە نەخۆش لەبەرامبەر ئەرک و تێکۆشانیی پزیشکەکاندا ویست و ئارەزووی خۆی بۆ چاکبوونەوە پیشان بدات، نەک بەپێچەوانەوە گوێ بە ڕێنمایی و ئامۆژگارییەکان نەگرێت و ڕیسەکە لە پسپۆڕان بکاتەوە بە خووری!(لامبوس، ل: ٧٤٨).

# چارەسەرکردن: لە نێوان (پسپۆڕی) و (میهرەبانی)دا

(حەکایەتی خۆش و ناخۆشی، نەخۆشخانە(*)

هەمیشە نەخۆشیی و لە نەخۆشخانە کەوتن ناخۆش نییە. نەخۆشیی بۆخۆی پڕیشە لە خۆشیی و چێژ کە ناکرێت بەشێوەیەکی دیکە و لە شوێنێکی دیکە ئەزموونی بکەین. ڕەنگە یەکەمین تۆوی چاکبوونەوە لە پەراوێزی ئەو ئەزموونەوە هەڵوەرێ کە ئێمە لەکاتی نەخۆشییەکەماندا و لەبەر دەردی ئازارەکان هەستی پێناکەین و تەنیا دوای جێهێشتنی نەخۆشخانە و بیرکردنەوەمان لە ڕۆژەکانی ئەوێ، دەبینین لە گۆشە و کەناری حەکایەتەکانەوە چەکەرە دەردەکەن، جارێکی دیکە سەوزمان دەکەنەوە و پێدەگرینەوە و خۆمان دەبینین بەسەر شەقامەکاندا پیاسە دەکەین، شتێک کە لەڕۆژانی نەخۆشخانەدا خەونمان پێوە دەبینی.

هەموو نەخۆشکەوتنێک و چاکبوونەوەیەک وەک ئەوە وایە: مرۆڤ مردبێت و سەرلەنوێ زیندوو بووبێتەوە. بۆیە هەلێکی باشە نووسین لەسەر ئەزموونی نەخۆشی و ئەو چاکبوونەوەیە بکەینە بەڵگەی زیندووبوونەوە و سەرلەنوێ تێهەڵچوونەوە لە ژیان و ئیمان و خۆشەویستی. بەمجۆرەش

حەکایەتی خۆشی نەخۆشیی دەستپێدەکات، حەکایەتێک کە خاڵیی نییە لە بەسەرهات و پەند و لێوەفێربوون، حەکایەتێک دەبوو ئەزموونی بکەین تاکو بتوانین قسانی لەبارەوە بکەین، حەکایەتی وەفا بۆ هەموو ئەو کەسانەی لەگەڵماندا میهرەبان بوون.

## حەکایەتی خۆشی نەخۆشیی:

خۆشترین ئەزموونی نەخۆشی و لە نەخۆشخانە کەوتن ئەوەیانە کە منداڵ و ناسک و عاشق دەبینەوە. منداڵ دەبینەوە چونکە دەزانین و چاوەڕوانیمان ئەوەیە کەسانێک هەن نازمان دەکێشن و چاوەڕوانیەکانمان دەهێننە دی و لەگەڵ خۆیاندا ماچ و چوکلێت و چەپکە گوڵمان بۆ دەهێنن و بەجۆرێ مامەڵە و هەڵسوکەوتمان لەگەڵ دەکەن، کە خۆشمان هەست بە منداڵبوونەوەی خۆمان بکەین. ئەوە بۆخۆی چێژێکی منداڵانەیە کاتێک دەوروبەرت پڕە لەو کەسانەی بەتەمەن لەخۆت گەورەترن و کەچی تۆ لەناویاندا پاڵت لێداوەتەوە و لەسەر قەڵەوێرەکەت لاقت لێدرێژ کردوون بەبێ ئەوەی ئەمەت لەسەر حساب بێت! ئەوەش منداڵبوونەوەیە کاتێک پزیشکەکان هەندێ خواردن و خواردنەوەیان لێقەدەخە کردویت، کەچی تۆ لە کەمترین هەلدا بۆت هەڵدەکەوێ، بەدزی شتێ دەکەیت بە زارتدا و پاشانیش کە پرسیارت لێدەکەن ئایا هیچت خواردووە، دەڵێی: (نە!). ئەو نەئگوتنە درۆ نییە، بەڵکو نەئێکی منداڵانەیە، خۆ شاردنەوەیە لە یاسای گەورەکان و قەدەخەشکێنیە. لێمگەڕێن ڕاستگۆیانەتر بدوێم: لەو ماوەیەدا کە من هەموو شتێکم لێقەدەخە کرابوو و تەنیا خۆراکیی کیسەییم

لە ڕێگەی دەماری دەستمەوە وەردەگرت، چەندین جار ئەو شتانەم خواردن کە نەدەبوو بیانخۆم! جارێک چوکلێتێک و جارێ کەوچکێ خواردن و جارێکی دیکە قاشێ میوە و ئەمجا پسکیت و لەفەی فەلافل و مریشک، کە بە دزی دەمهێنانە ژوورەوە. کاتێکیش خواردنی نەخۆشخانە دەهات، بەدەنگی بەرز و بەو مەبەستەی پزیشکە چاودێرەکان گوێیان لێم بێت، دەمگوت: (من نابێت هیچ بخۆم)! شەوانەش دوو کەوچک ڕۆنگەرچەکم دەخوارد تاکو هەرچی لە گەدەمدایە بیکاتە ئاو، ئاوێکی ڕوون..

لە نەخۆشیدا ناسکیش دەبینەوە، ناسک تا سنووری شاعیریی و گریان، چونکە هەمیشە ئەو ساتانە دێن کە هەموو نەخۆشەکانی دیکە خەویان لێکەوتووە و ڕاڕەوەکان بێدەنگ و گڵۆپەکان کوژاوە و ئیدی دەنگی ئاوەچۆڕکەی دەستشۆری و جیڕەی قەڵەوێرەکەت و ناڵەی نەخۆشەکان و چرکەی دەمژمێرەکە دەبیستیت و هەستیارییەکی سەیر دەستپێدەکات. هەستیارییەک هاوشانە بەتەنیاییەکی کوشندە و ترسێک کە نازانیت ئایا سەرچاوەکەی لە مردنەوەیە یاخود لە تەماشاکردنی خۆت و ئەو هەموو بێدەسەڵاتییەی کە نەخۆشبوون بەسەرتا سەپاندوییەتی. بەهەرحاڵ، ئیدی بەدەست خۆت نییە و هێندەی پێناچێت کە دیوارێکی سوێر لەنێوان نیگا و دەور و بەرتدا دروستدەبێت، دیواری گریان. من یەکەمجار تێنەدەگەیشتم ئایا خۆم ئامادە دەکەم بۆ مردن یاخود بۆ چاکبوونەوە. هەستمدەکرد بەشەکانی جەستەم چیدی پێکەوە هاوکاریی ناکەن و خەریکم دەبمە لاشەیەک، کە وزەی تێدا نییە خۆی لە شوێنێکەوە بگوێزێتەوە بۆ شوێنێکی تر.

لەنەخۆشخانەکەوتن جۆرێ لە هەستی عاشقبوونەوەشمان تێدا زیندوو دەکاتەوە: زەمەنی عاشقی و زەمەنی نەخۆشی هەردووکیان لە ئاه و ناڵە و چاوەڕوانی و بیرکردنەوە و وێناکردنی بەرامبەردا هاوبەشن. هەروەک چۆن لەسەر تەختی نەخۆشخانە چاوەڕێی هاتنی ئەو فریادڕەسە دەکەین کە خۆشمان دەوێت، یان کە تەمەننای هاتنی لەپڕی دەکەین تا بەئەسپایی دەرگاکە بکاتەوە و ڕزگارمان بکات لە ئازارەکان، بەهەمان شێوە عاشقبوونیش جۆرێکە لە کەوتن لەسەر ڕێگاکان و لە قەراخ کانی و ژێر سێبەری درەخت و شۆستەی شەقام و کۆڵانەکاندا.. عاشقەکان و نەخۆشەکان هەردووکیان لەوێدا کەوتوون تا (ئەو) دەرکەوێت و زیندوویان بکاتەوە، یاخود بەیەکجاری ڕۆحیان بکێشێ..

دەشێت ڕۆژەکانی نەخۆشخانە جۆرێ لە خواستی بەزەیی پێداهاتنەوەشمان تێدا دروستبکات و تەمەننا بکەین، ئەو یارە دڵڕەقەی هەرگیز دڵدانی خێرمان پێدا ناهێنێ، هەرگیز لێمان ناپرسێت و وەهای پیشان دەدات ئێمەی بەلاوە گرنگ نییە، لەم ڕۆژە تاریکانەدا بێت و ناو دڵمان بە حوزووری خۆی ڕووناک بکاتەوە و ئیتر بشمرین قەیدی ناکات، چونکە بێگوناه دەچینە ئەو دنیا تاریکەوە، کە جگە لە دڵی ئێمە هیچ ڕووناکاییەکی تێدا نییە، ڕووناکاییەک سەرچاوەکەی لە لوتف و میهرەبانیی ئەوەوەیە!

خۆشییەکانی نەخۆشیی لەمەش تێپەڕ دەکات و ڕەهەندێکی کۆمەڵایەتیش بەخۆیەوە دەگرێت، کە تیایدا ئێمە دەبینە خاڵی پێکگەیشتنی ئەوانیتریش. هەر لەنەخۆشخانەدایە کە هاوڕێ و کەسوکارە دوور و نزیکەکانمان بەیەکتر دەناسێنین و

کەشوهەوایەکی کۆمەڵایەتی دروستدەبێت لە نێوانیاندا. نائاشناکان بەیەکتر ئاشنا دەبن و زویرەکان ئاشتدەبنەوە و دیدارەکان تازە دەکرێنەوە و جۆرێ لە مەراسیمی دڵپاکبوونەوە و گەردن ئازادی دێتە ئاراوە. لەهەمووشی سەیرتر ئەوەیە لەپڕ کەسانێک دەبینین کە وامان هەستدەکرد خۆشیان ناوێین، لە نکاو ئەو کاربەدەست و بەڕێوەبەر و ڕاوێژکار و سیاسەتمەدارانەش دێنە سەردانمان و تەلەفۆنمان بۆ دەکەن، کە بینین و چاوپێکەوتنیان ئاسان نییە، تەنانەت ئەگەر واسیتەیەکی چاکیشت هەبێت!

کەواتە لێگەڕێن دووبارەی بکەمەوە، کە نەخۆشیی هەر تەنیا ناخۆش نییە، بەڵکو چێژبەخشیشە، وەلێ تەنیا دوای ئەوەی کەمێ چاکدەبینەوە و مەودایەک لە ڕۆژە ناخۆشەکانی نەخۆشخانە وەردەگرین. ئەو ڕۆژانەی نامەنەوێ هەرگیز دووبارە ببنەوە، نامانەوێ هەرگیز ئەزموونیان بکەینەوە، چونکە هەر لەوڕۆژانەدا بوو کە هەستماندەکرد بەپێچەوانەی چاوەڕوانییەکانی خۆمانەوە، بەشێک لە گەورەیی و جوانیی مرۆڤیانەی خۆمان لەدەست دەدەین و لە پێناوی چاکبوونەوەی جەستەماندا، ڕۆحیشمان بریندار دەبێت و ورە و ئیرادەمان لە بارودۆخێکی نامرۆڤانەی نەخۆشخانەدا وێران دەکرێت.

## حەکایەتی ناخۆشی نەخۆشی:

لێرەوە حەکایەتی (ناخۆشی نەخۆشبوون) دەستپێدەکات. حەکایەتێک پڕە لە ڕووداوی دڵتەزێن، کە ڕەنگە نرخ و بەهای گێڕانەوەیان تەنیا لەوەدا بێت تا پتر تێبگەین ئاخۆ چۆن پەیوەندییە شێواوەکان بوونەتە بەشێکی جیانەکراوە لە

سیستەمی تەندروستیمان و چۆن ئەم سیستەمە خاڵییە لە جیهانبینییەکی مرۆڤدۆستانەی پراکتیکی و چۆن ئەمەش پەیوەندیی هەیە بە جیهانبینییەکی سیاسییەوە کە لەسەر بنەمای خۆشویستنی مرۆییەوە دروست نەبووە و هیچ گوتارێکی نییە بۆ چەسپاندنی چەمکی هاووڵاتی و هاونیشتمانی و تەبایی کۆمەڵایەتیمان. حەکایەتی ناخۆشی نەخۆشی، بە پێچەوانەی حەکایەتی پێشووەوە، ناکرێت بە ئەزموونێکی شەخسیی دابنرێت و هەرتەنیا پەیوەندیی هەبێت بە میزاجی نووسین و ڕەهەندی ئێستاتیکیانەی نووسەرەوە. بەڵکو ئەم بەشەی حەکایەتەکەمان بۆی هەیە بەیادهێنەرەوەی ئەزموونی هەموومان بێت لەکاتی نەخۆشکەوتن و سەردانی نەخۆشخانەدا. ئەگەرچی ڕەنگە ئەوە ئەزموونێک بێت و نەمانەوێ جارێکی دیکە بیری لێبکەینەوە..

## نەخۆشخانە کوێیە؟

هەرگیز ئەم پرسیارە لە منداڵەکان مەپرسە، چونکە ئەوان هەمیشە لە ترسێکەوە وەڵامت دەدەنەوە کە ڕەنگە واقیعیترین و ڕاستگۆیانەترین ترس بێت کە هەرگیز دانی پێدا نەهێنراوە: لە ڕوانگەی منداڵانەوە نەخۆشخانە ئەو شوێنەیە کە ئەوان لێیدەترسن، ترس لە ئازار و ترس لە هەڕەشە و ترس لەدەرزی و دەرمانی کۆکە و حەپی تاڵ!

دایکانی ئێمە کاتێک بیانەوێ منداڵەکانیان بترسێنن، پێیاندەڵێن: (وسبە!، با پزیشکەکەت بۆ بانگ نەکەم).. لێرەشەوە پەیوەندییەک هەیە لە نێوان پزیشک و ترسدا، هەروەک چۆن ترس لەو شوێنەوە، لەو ماڵ و (خانە)یەوەوە دێت کە شوێنی

کارکردنی پزیشکەکانە: لە نەخۆشخانەوە! بەم پێیەش ئێمە لەبەردەم ناکۆکیەکداین: لەلایەکەوە نەخۆشخانە ئاماژە بە ماڵێک دەکا، کە تایبەتە بە نەخۆشەکان. لە کولتووری ئێمەدا (ماڵ / خانە) هەمیشە ئاماژەیە بە شوێنێک بۆ ئاسایش و دڵنیایی و پارێزگاری. ماڵ/خانە چوارچێوەیەکە دەمانپارێزێت و ناهێڵێت دنیای دەرەوە بەئاسانیی دەستدرێژیمان بکاتە سەر. بەم پێیەش نەخۆشخانە واتە: شوێنێکی دڵنیا و ئاساییش بۆ پارێزگاریکردن لە نەخۆشەکان، واتە لەو کەسانەی کە پێویستییان بە چاودێری و یارمەتیدانێکی کاتی هەیە.. لەلایەکی دیکەوە: لە یادوەریی منداڵانەی ئێمەدا نەخۆشخانە ئەو شوێنەیە کە پڕە لە ترس و ئازار.. کەواتە لەگەڵ قسەکردنماندا لەسەر نەخۆشخانە دەکەوینە بەردەم دوو پێناسەی سەیر و لێکدی دوور: پێناسەیەکیان ئەوەیانە کە سیستەمی تەندروستی بۆ یەکێک لە گرنگترین دەزگاکانی خۆی کردویەتی و جێ پەسندییەتی، پێناسەی دووەمیش ئەوەیانە کە لە یادوەریی منداڵانەی ئێمەدا دروستبووە و ماوەتەوە. ڕەنگە ئەوەی لەلامان یەکێک لەم دوو پێناسەیە زیاتر دەچەسپێنێت، ئەزموونی نەخۆشیی بێت، ئەزموونێک کە پێویستی بەوە هەیە لە نەخۆشخانە بخەوین:

## نەخۆشی چییە؟

نەخۆشی و نەخۆشکەوتن تاوانێک نییە، بەڵکو دۆخێکی نائاساییە لە ژیانی زیندەوەردا کە چەند سیما و ڕەهەندێک بەخۆیەوە دەگرێت. مەرج نییە نەخۆشی هەرتەنیا نەخۆشکەوتنی جەستە و ئۆرگانەکانی لەش بێ، بۆی هەیە

ڕەهەندێکی کۆمەڵایەتی هەبێت و کۆمەڵناسێک ناوی بنێ (نەخۆشییە کۆمەڵایەتیەکان)، بۆیشی هەیە ڕەهەندێکی دەروونی هەبێت و دەروونشیکارێک هانبدات باس لە (نەخۆشییە دەروونییەکان) بکات، هەروەها بۆی هەیە ڕەهەندێکی ئاکاریی وەربگرێت و ئاکارناسێک دنە بدات بۆ دەستنیشانکردنی (نەخۆشییە ئاکاریەکان) و زۆرجاریش مرۆڤناسەکان باس لە (نەخۆشییە کولتووریەکان) دەکەن. بەم پێیە نەخۆشیی لەبواری جیاوازدا چەندین ئاست و چەندین سیمای هەیە. وەلێ نەخۆشیی وەکئەوەی لە سیستەمی تەندروستیدا تێیدەگەین بریتیە لە (ئالوودەبوون بە دۆخێکی نائاسایی و شێوانی یەکگرتوویی جەستەیی، یان دەروونیی، یاخود هەردووکیان پێکەوە).(١)

وەلێ ناتوانین لە دەرەوەی کۆمەڵگەیەکی کۆنکرێتی و بەرجەستە باس لە نەخۆشی بکەین. بۆیە ئەگەر ئەو شێوان و نائاساییبوونە باری دەروونی بگرێتەوە، ئەوە زۆربەی کات ڕەهەندێکی خێزانی و کۆمەڵایەتیش دەگرێتەوە. یاخود ڕاستر وایە بڵێین: لەگەڵ هەر نەخۆشکەوتنێکدا بەشێک لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانیش نەخۆش دەکەون و هەموو دەم نەخۆشی بەنیسبەت کۆمەڵگەوە قەیرانێکی بارگرانە. بەڵام کۆمەڵگەش بۆخۆی لە دروستکردنی نەخۆشییەکاندا ڕۆڵێکی تایبەتی هەیە، چونکە بەشێکی زۆری سەرهەڵدان و گەشەکردنی نەخۆشییەکان سەرچاوەیەکی کۆمەڵایەتیانەیان هەیە. بۆنمونە زۆرن ئەوانەی لەئەنجامی هەلومەرجی نالەباری کارکردنەوە نەخۆش دەکەون، یاخود بارودۆخی ژیان و ماڵ و حاڵیان دەبێتە هۆی پەیدابوونی نەخۆشی و هەروەها بۆی هەیە

نەبوونی زانیاری تەواویش لەبارەی ئەو ئامێرانەی بەکاریان دەهێنین ببێتە هۆی جۆرێک لە نەخۆشی، بۆ نمونە ئامێری کۆمپیۆتەر. ئەمە جگە لەوەی جۆری ئەو خواردنانەی دەیانخۆین و هەندێ خووی کۆمەڵایەتیش، کە دەشێت وەک جۆرێ لە نەخۆشی دەربکەون.

کاریگەریی کۆمەڵگە لەمەش دەترازێت و زۆر ڕاستەوخۆتر کار دەکاتە سەر کەسایەتی مرۆڤ و ئەندامەکانی. لێکۆڵینەوەکان ئەوەیان دەرخستووە، شێوەی کۆمەڵگەکان ڕۆڵێکی زۆریان هەیە لە دروستکردنی مرۆڤی نەخۆش یاخود تەندروستدا. ئەو کۆمەڵگەیانەی کراوەن و ئازادی و مافی قسەکردن تیایاندا پارێزراوە، ناڕاستەوخۆ بوونەتە ڕێگر لەبەردەم سەرهەڵدانی ئەو جۆرە نەخۆشیانەدا، کە تاکەکەس لە کۆمەڵگە داخراو و بەخۆداچووەکاندا دووچاریان دەبن.(٢)

ئێمە دەتوانین لەسەر هەمان بنەماوە بڵێین: تەنانەت جۆرەکانی سیستەمی سیاسیی و بەڕێوەبردن و کۆنترۆڵکردنیش ڕۆڵی زۆر دەگێڕن لە دروستکردن و بەرگریکردن لەبەرامبەر نەخۆشیدا. بۆ نمونە: لەو سیستەمە سیاسییانەدا کە پەرە بە نایەکسانیی کۆمەڵایەتی دەدەن و لە پێناوی ڕازیکردنی دەستەیەکی هەڵبژاردەدا، کۆی کۆمەڵگە دەخەنە پەراوێزەوە، کە ئەمە سیاسەتی حیزبە دەسەڵاتدارەکانی کوردستان بووە لەو ساڵانەی دواییدا، جۆرێک لە کێبەڕکێ و ئیرەیی کۆمەڵایەتی بەرهەم دێت، کە بۆی هەیە ئەم ئیرەیی بردن و حەسادەتە لە ئەنجامی کەڵەکەبوونی زۆر و بەردەوامەوە، ببێتە خەسڵەتێکی دەروونی تاکەکان، پاشانیش توندڕەوی کۆمەڵایەتی ببێتە یەکێک لە

دەرکەوتەکانی وەکئەوەی لەناو هەموو توێژە کۆمەڵایەتیەکاندا هەستی پێدەکەین و لە ژیانی ڕۆژانەدا ڕەنگدەداتەوە.

بەڵام بابزانین چۆن نەخۆشییەکی دەروونیی تاکەکەس ڕەهەندی کۆمەڵایەتی بەخۆیەوە دەگرێت؟

زۆرینەی زانیارییە تیۆرییەکان مەزەندەی ئەوە دەکەن، مرۆڤ لە بچووکترین یەکەی کۆمەڵایەتیدا و لە دۆخی سرووشتیانەدا ژیانێکی ئاسایی هەیە، کە ئەویش خێزانە و نابێت ژمارەی پێکهێنەرەکانی لە دوو کەس کەمتر بن. کاتێک دەزانین نەخۆشییەکی دەروونی ڕەهەندی کۆمەڵایەتی هەیە، کە بزانین یەکگرتوویی و پێکەوەگونجانی لایەنی جەستەیی، دەروونی و کۆمەڵایەتی ئەو مرۆڤە تێکچووە و زامدار بووە. مرۆڤ لەگەڵ نەخۆشکەوتنیدا هەر تەنیا جەستەی زامدار نابێت، بەڵکو هەستیش بە تەنیایی و جۆرێ لە پەراوێزکەوتن دەکات. هەر بۆیەشە مرۆڤی نەخۆش لەگەڵ داوای چارەسەرکردنی نەخۆشییەکەیدا، لەو کاتەدا کە داوای یارمەتیمان لێدەکات، دەستی تکاکاریش بەرز دەکاتەوە تا لەو تەنیایی و گۆشەگیری و پەراوێزبوونەی بەهۆی نەخۆشییەکەیەوە تێیکەوتووە، ڕزگاری بکەین. لەم ڕوانگەیەوە، نەخۆشکەوتن هەرتەنیا مەترسیی و هەڕەشەیەک بۆ سەر ژیانی ئۆرگانی و جەستەیی تاکە مرۆڤ نییە، بەڵکو هەڕەشەیەکیشە بۆ سەر ژیانی دەروونی و کۆمەڵایەتیشمان(٣).

لە کۆمەڵگەیەکدا کە جۆرەها نەخۆشی بەربڵاو بێت، واتە ئەو کۆمەڵگەیە خۆی لەبەردەم جۆرەها مەترسیدا دەبینێتەوە. لێرەشەوە سیستەمی تەندروستی کۆمەڵگەیەک هەرتەنیا ئەرکی

چاککردنەوەی جەستەیی نەخۆشەکانی لەسەرشان نییە، بەڵکو بەرپرسیاریشە لە ئاساییکردنەوەی کۆی ژیانی کۆمەڵایەتی لەڕێگەی دژایەتیکردنی هۆکاری نەخۆشییەکان و هاوکاریکردنی هاووڵاتیانەوە. بەمانایەکی دیکە: نەخۆشخانەکان هەرتەنیا میرنشینێک نین و پزیشکەکانیش میری خاوەندەسەڵاتی ناویان، بەڵکو ئەوان سەربازی ناو قەڵایەکی گرنگن، کە دەبێت دووژمنێکی نادیار لە کۆمەڵگە دوور بخەنەوە. بۆیە کار لەبواری تەندروستیدا هەرتەنیا کارکردنێکی پسپۆڕیی نییە لەسەر ئۆرگانە شێواو و نەخۆشکەوتووەکانی جەستە و نووسینی ڕەچەتە و دەرمان بۆیان، بەڵکو مامەڵەکردنیشە لەگەڵ مرۆڤدا وەک کائینێکی کۆمەڵایەتی هەستیار و خاوەن گەورەیی و عیززەتی نەفس، کە نابێت پێشێل بکرێت.

لێرەوە گرنگیی و لەبیرنەکردنی چەمک و ڕەهەندی (مرۆڤ) لە سیستەمی تەندروستیدا دەردەکەوێت، چونکە هیچ سیستەمێکی تەندروستیی تەندروست، بەبێ تێگەیشتنێکی تایبەت لە مرۆڤ سیستەمێکی کامڵ و تەواو نابێت. دەشێت ئێمە لە سیستەمی تەندروستیماندا باشترین ئامێر و بەرزترین ئاستی پسپۆڕی و گەورەترین نەخۆشخانەمان هەبێت، بەڵام ئەگەر تێڕوانینێکی ئاکاریانە و مرۆڤدۆستانەمان نەبوو، ئەوە لەبەردەم قەیرانێکی مەزنداین کە وا دەکات لە نەخۆشخانەکانماندا هەمان مامەڵە لەگەڵ نەخۆشدا بکرێ، کە لەناو بەندیخانە و بازاڕەکاندا دەکرێت.

ئەوە نەبوونی تێگەیشتنێکی ئاکارییە لە مرۆڤ کە هەر لەبەردەرگای نەخۆشخانەوە تا دوایین پزیشک وەک کۆیلە

مامەڵە لەگەڵ نەخۆشدا دەکرێت. ئەوە نەبوونی جیهانبینییەکی مرۆڤدۆستانەیە لە سیستەمی تەندروستیی ئێمەدا، کە تۆڕێک لە قاچاخیکردن بە کەلوپەلەکانی نەخۆشخانەوە دروستدەبێت و وادەکات لە عەیادەکانی لاکۆلاندا کەلوپەلی خاوێنترت دەستکەوێت وەک لە نەخۆشخانەی گشتیی!. ئەوە قەیرانێکی گەورەیە لە ئاکاری پزیشکیدا کە نەخۆش بۆی نەبێت هیچ قسەیەک بکات، هیچ زانیارییەک لەسەر شێوازی چارەسەرکردنەکەی وەربگرێت، هەموو بەرپرسێکی پرسگەکان و هۆڵەکانی نەخۆشخانە بۆیان هەبێت بەسەریدا هاوار بکەن: (وەرە بۆ کوێ دەچیت؟)، بۆی نەبێت بڵێت: (ئەم دژداشەیە نەشۆراوە و لەبەری ناکەم) و هیچ جلوبەرگێکی خاوێن دەستنەکەوێت، بۆی نەبێت بڵێت: (ئەم سرنجە بەکارهاتووە و بەکاری ناهێنم) و دواجار ئەوە باوکسالارییەکی ناتەندروستانەیە کە لەکاتی هاتنە ژوورەوەی پزیشکەکاندا، نەخۆشەکان ناچار بکەیت وەک پۆلی یەکەمی سەرەتایی هەموو هەستنە سەرپێ و پێیان بڵێیت: (قسە لە قسەی پزیشکدا مەکەن) و هتد..

نەبوونی تێگەیشتن لە چەمکی مرۆڤ و بچووککردنەوەی مرۆڤ لە نەخۆشبوونەکەیدا و مامەڵەکردنی وەک تاوانبارێک، ئەو کۆمیدیایەیە تەنیا لە نەخۆشخانەکانی ئێمەدا بوونی هەیە. بۆیە زۆرباش تێدەگەم، گەر هاووڵاتیانی ئێمە بەیەکجار نەخۆشکەوتن و چوونیان بۆ نەخۆشخانە، لەم وڵاتە بتۆرێن و ڕقیان لە مرۆڤبوون و کوردبوون و هاونیشتمانیبوونی خۆیان ببێتەوە. پاشان ئەوە چ چاککردنەوە و چارەسەرکردنێکی جەستەی نەخۆشەکانی ئێمەیە، کاتێک تۆ دڵیان دەشکێنی و

تەریقیاندەکەیتەوە و وەک زۆردار بەناویاندا بەپەلە دەڕۆیت بەبێئەوەی کاتێکی تایبەتیان بۆ تەرخان بکەیت و هەواڵی تەندروستییان بپرسیت؟

من لەماوەی ئەو چەند ڕۆژەدا لە نەخۆشخانە هیچ پزیشکێکم نەبینی ماوەی سەردانی بۆلای کۆی نەخۆشەکانی ژوورێک بگاتە دە خولەک و هیچ پزیشکێکم گوێ لێنەبوو نەخۆشەکان بەناوی شەخسیی خۆیانەوە بانگ بکات. ئەوەندەی لە نەخۆشخانە گوێت لە (خاڵە و مامە و پووریێ و کاکە و برا و هێی تۆ..) و شتی لەمجۆرە دەبێت، لە بازاڕیش گوێت لێنابێت !

وەستانەوە لە دژی نەخۆشی و کارکردن لە پێناوی تەندروستیدا، بەبێ تێگەیشتنێکی ئاکاریانە لە مرۆڤ و گەورەیی مرۆیی و تاکەکەس، قەیرانێک بەرهەم دەهێنێت کە ناهێڵێت سیستەمی تەندروستی لە بیناکردنەوەی ڕۆحی بریندار و ماندووی مرۆڤی ئێمەدا بەشدار بێت. هەرگیز چارەسەرکردن و چاککردنەوەی جەستەیی نەخۆشەکان بەتەنیا بەس نین بۆ ئاساییکردنەوەی ژیانیان ئەگەر لەشێوازی ڕەفتار و گوفتاری پزیشک و کارمەندەکانی سیستەمی تەندروستیدا هەستیان بە میهرەبانی نەکرد. بەڕاستی خەڵکی ئێمە لەناخەوە دەترسن بچنە لای پزیشک و دەبینین ڕۆژگارێک بەئازارەوە دەناڵێنێت و نایەوێت بچێتە نەخۆشخانە و عیادەکان... ئایا هەرگیز لەخۆمانمان پرسیوە ئەم هەموو ترسە لە چوونە لای پزیشک بۆچی؟ لەکاتێکدا ئێمە دەزانین لە کولتووری ئێمەدا پزیشک فەریادڕەسێکە و دەستی ئەو شفابەخشە؟!

## تەندروستی چییە؟

ئێمە لەژیانی ڕۆژانەدا کاتێک گوێمان لە وشەی (تەندروستی) دەبێت، یەکسەر ماناکەی دەبەستین بە لەشساخی و غیابی نەخۆشییەوە. ڕەنگە هۆی ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ مانای وشەی (تەن) کە لە زمانی ئێمەدا هەندێجار بۆ لەش و جەستەش بەکاردێت و لێرەشەوە وایکردووە کاتێک دەڵێین: تەندروستی، ئەوە یەکسەر بیبەستین بە دۆخی فیزیکیی جەستەوە. وەلێ لەو پێناسەیەدا کە ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی (WHO)بۆ دۆخی تەندروستی کردووە، ڕووبەڕووی تێگەیشتنێکی تایبەت و لەهەمان کاتدا گرنگ دەبینەوە لەسەر چەمکی تەندروستی، کە جیاوازە لەو مانایەی ئەم وشەیە لە زمانەکەماندا هەیەتی. لە پێناسەکەی ڕێکخراوی ناوبراودا، تەندروستی هەر تەنیا لەبەرامبەر نەبوونی نەخۆشیدا دانەندراوە، واتە تەندروستی هەر تەنیا ئەوە نییە نەخۆشیی لەئارادا نەبێت و مرۆڤ لەشساخ بێت، بەڵکو : ***(تەندروستی دۆخێکی لەسەدا سەد ساخ و گونجاوی جەستەیی، مەعنەوی و کۆمەڵایەتییە، نەک هەرتەنیا غیابی نەخۆشی و پەشێوی)***(٤).

بەپێی ئەم پێناسەیە، دۆخی تەندروستی بریتییە لە: پێکەوە گونجان و ئارامییەکی بێغەشی لایەنی (فیزیکی و مێنتاڵی و کۆمەڵایەتی) ژیانی مرۆڤ. واتە مرۆڤ تەنیا ئەو کاتە تەندروستە کە لەشی ساخ بێت، زەین و دەروونی هاوسەنگ بێت و لە ڕووی کۆمەڵایەتیشەوە تەبا بێت. بەپێی تێگەیشتن لەو پێناسەیەی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی، ئەوەی سیستەمی تەندروستی وادەی پێداوین، بریتییە لەوەی وەک دەزگایەکی ڕەسمی و دەروەست یارمەتیمان بدات بۆ گەیشتن

بە تەندروستییەکی لەو بابەتەی لە پێناسەکەدا هاتووە. دیارە ئەوەشمان لەبیر نەچێت ئەو پێناسەیە پێناسەیەکی ئایدیاڵییە و ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە سیستەمی ناوبراو هەوڵی گەیشتن بەو ئایدیاڵە دەدات تا زۆرترین چاوەڕوانییەکان جێبەجێ بکات.

کەواتە تەندروستیی ژیانی مرۆڤ هەر تەنیا بە حەپ و دەرمان و دەرزی لێدان و نەشتەرگەری و تەکنیکەکانی پزیشکی و چوونە عیادە و کەوتن لە نەخۆشخانە، تەئمین ناکرێت. بەڵکو تەندروستی گێڕانەوەی دۆخی سرووشتیی جەستە و دۆخی ئاسایی دەروونی و دۆخی تەبایی کۆمەڵایەتیە بۆ ژیانی مرۆڤ. لێرەشەوە تێدەگەین، کە ئەرکی سیستەمی تەندروستی و کارمەند و پزیشکەکانی ناو ئەم سیستەمە، هەر تەنیا (ئەرکێکی پسپۆڕیی)، لە بواری چاککردنەوەی میکانیزمەکانی جەستەدا نییە، بەڵکو لەهەمان کاتیشدا گێڕانەوەی بەها و ئابڕووی کۆمەڵایەتیە بۆ کەسایەتی نەخۆش. ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە گەر پزیشکێک وا بزانێت ئەو تەنیا بەرپرسیارە لەبەرامبەر چاککردنەوەی ئەندامە لەکارکەوتووەکانی جەستەی نەخۆشدا، با لەو کارەشدا زۆر شارەزا و بەناوبانگیش بێت. نەخۆشێک تەنیا وەک (جەستەیەکی لەکارکەوتوو) ناچێتە بەردەم پزیشک و یاوەرەکانیان، ئەو هەرتەنیا بچووکناکرێتەوە لەوەدا کە بۆتە (موراجیع) و لەڕیزی ناو عەیادە گەرم و پیس و چەپەڵەکانی شەقامی پزیشکاندا و لە کەنار دیواری هۆڵەکانی نەخۆشخانەی ڕزگاری و کۆماریدا، چاوەڕوانە دەستێکی شفابەخشی پێبگات.

نەخۆش بەهەموو گەورەیی مرۆڤانەی خۆیەوە، بەهەموو ناسنامەی کەسایەتی و هەیبەتی کۆمەڵایەتی و سەرمایەی

ڕەمزیی خۆیەوە، بەهەموو عیززەتی نەفس و ئەزموونی ژیانی خۆیەوە دەچێتە لای پزیشکەکان. نەخۆشبوونی ئەو، لەکارکەوتنی ئەندامێکی لەشی و پەککەوتنی میکانیزمەکانی جەستەی نەخۆش، هیچیان لە گەورەیی ئەو وەک مرۆڤێکی هەستیار و هۆشمەند و خاوەن دنیای سەربەخۆ، کە تیایدا تێگەیشتنێکی جوان و ڕێزدارانەی هەیە لەسەر خۆی، کەمناکەنەوە. ئەو پزیشکەی لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەی نەخۆشێکدا گەورەیی مرۆیی و کەسایەتی نەخۆشەکەی بەلاوە گرنگ نەبێت، جگەلەوەی زیانێکی ئاکاریی بە پسپۆڕی و پیشەکەی خۆی گەیاندووە، ئەوە لەهەمان کاتیشدا دەستدرێژی کردۆتە سەر بوونی ئەویتر و بۆتە هەڕەشەیەک بەسەریەوە.

بۆیە گرنگە دووپاتی بکەینەوە، کاتێک ئاماژە بە پێویستیی هەبوونی (ئاکاری پزیشکی) لە کوردستاندا دەکەین، هەر تەنیا مەبەستمان ئەوە نییە پزیشک و یاوەرەکانیان و قوتابییەکانی ژێر دەستیان ئەرکە پسپۆڕییەکەی خۆیان بەباشی و سەرکەوتوویی ئەنجام بدەن و مەقەست و سرنج و تۆپەڵە پەڕۆ لەناو سکی عەمەلیاتکراوەکاندا جێنەهێڵن (ئەگەرچی نمونەی ئەمەش کەم نییە!)، بەڵکو لەوە زیاتر مەبەستمانە جەخت بکەینەوە سەر ئەو پەیوەندییەی کە پزیشک دەبەستێت بە نەخۆشەوە. بەپێی مەبدەئی سەرەکیی ئەو پەیوەندییە، پێش ئەوەی پەیوەندیی نەخۆش و پزیشک، یان نەخۆش و چارەساز بێت، پەیوەندیی نێوان دوو مرۆڤە کە چاوەڕوانیان لەیەکتر ئەوەیە: ڕێز لە گەورەیی یەکتر بگرن.

کەواتە هیچ چارەسەرکردنێکی پسپۆڕیی ڕووت و پیشەیی ڕووتمان لە کاری پزیشکیدا نییە ئەگەر لەهەمان کاتیشدا ئەو

چارەسەرکردنە بە هەڵویستێکی مرۆڤیانەی نێوان پزیشک و نەخۆشدا تێپەڕ نەبوو بێت.

## چارەسەرکردن چییە؟

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە وەڵامی ئەم پرسیارە بەوە بدەینەوە کە: (چارەسەرکردن بریتییە لە گونجاندنەوەی، یاخود هێنانەوەی نەخۆش بۆ ناو ژیانی کۆمەڵایەتی و ئۆرگانیکیانەی ئاسایی). بەمانایەکی تر، ئەگەر نەخۆشکەوتن لادانێک بێت لە ژیانی ئاسایی و لەکارکەوتنی بەشێک بێت لە میکانیزمی جووڵەی لەشمان و لێرەشەوە دروستبوونی ڕێگر بێت لەبەردەم ژیانێکی کۆمەڵایەتیانەی سرووشتیدا، ئەوە چارەسەرکردن بریتییە لە: بەخشینەوەی وزە و هێز بە نەخۆش تاکو هەستنەکات ئەو جیاواز لە ئەوانیتر دەژی. بۆئەوەی مرۆڤ ئەو هەستەی لەلا دروست نەبێت و لە ناخەوە ئامادە بکرێتەوە بۆ چاکبوونەوە، زۆر پێویستە ڕێزی لێبگرین و لەگەڵیدا میهرەبان بین. هۆی چییە ڕێزگرتن و میهرەبانیی لە پیشەی پزیشکیدا و لەکاتی چارەسەرکردندا هێندە گرنگ و پڕبایەخە، لەکاتێکدا ئەم پیشەیە کارێکی زانستیانەی وردە، نەک هەڵسوکەوتێکی کۆمەڵایەتی؟

لێرەدا باس لەو هۆکارە زۆر سادەیە ناکەم کە پێماندەڵێت: بەبێ نەخۆشەکان، بوونی پزیشکەکان بوونێکی زیادەیە و تەنەنات پزیشکەکان ڕەوایەتیی خۆیان لە هەبوونی نەخۆشەکانەوە بەدەستدەهێنن، چونکە ئەگەر نەخۆشەکان نەبن پیشەی چارەسەرکردن جگە لە بێکاری هیچ لێکدانەوەیەکی دیکە هەڵناگرێت. کەواتە دەبێت ڕێز لە نەخۆشەکان بگرین

چونکە بوونی ئێمە وەک پزیشک بەندە بەبوونی ئەوانەوە. هەروەها نامەوێت لێرەدا باس لەو فاکتەرە کولتووریانە بکەم کە لە بواری ئاڵوگۆڕی کۆمەڵایەتیدا *Social*) (Communicationگرنگیی بە ڕێزگرتنی بەرامبەر دەدەن و لە کولتووری ئێمەشدا ئەمە خاڵێکی چەسپاوە و ڕێزگرتن پارسەنگێکە بۆ هەڵسەنگاندنی کەسایەتی مرۆڤ لە هەموو کردە و ڕەفتارە کۆمەڵایەتیەکاندا.

ئەوەی لێرەدا بەلامەوە گرنگە ئەوەیە کە لە پیشەی پزیشکیدا ڕێزگرتن بایەخێکی تایبەتی هەیە جیاواز لەو بایەخەی لە کۆمەڵگەدا هەیەتی، چونکە پەیوەندیی نێوان پزیشک و نەخۆش پەیوەندییەکی (هاوکارانە)یە نەک (دەسەلاتدارانە)، پەیوەنددارانەیە(relational)، نەک پێگەخوازانە(positional). بۆ ئەوەی پزیشکێک گیانی متمانە لە نەخۆشەکەیدا پتەو بکات و هانیبدات بەباشترین شێوە هاوکاریی بکات، پێویستە ڕێزی لێبگرێت و ڕێزگرتن بکاتە بەرگرێک لەبەردەم دروستبوونی ترسدا، چونکە زۆر ئاساییە لە غیابی متمانەدا، ترس دروست ببێت. بۆیە لەبەرژەوەندیی پزیشکدا نییە نەخۆشەکەی لێی بترسێ، چونکە لەبنەمادا ئەو نایەوێت ڕەگەزێکی دەسەلاتمەند و بالادەست بێت و ترسیش ڕێگرە لەبەردەم چارەسازییەکی تەندروستانەدا کە وردبینییەکی زانستی و میهرەبانییەکی مرۆڤانەی پێویستە. ڕاستە نامانەوێت وەک ڕۆمانتیکەکانی سەدەی حەڤدەیەم بڵێین: (دەبێت پەیوەندیی نێوان پزیشک و نەخۆش جۆرێک بێت لە هاوڕێیەتی ڕۆمانسیانە)، چونکە پەیوەندیی پزیشک بە نەخۆشەوە هەمیشە پەیوەندییەکی پسپۆڕانەیە و ئەمەش

پێویستی بە مەودایەک هەیە لە نێوان هەردوو لایەندا، بەڵام گرنگە پزیشکەکان پسپۆڕیی خۆیان نەکەنە دەسەڵاتێک بەسەر نەخۆشەوە. ئەوەش لە وڵاتێکدا کە مرۆڤەکانی بەهەموو جۆرە دەسەڵاتێک تۆقێنراون.

کەواتە بەپلەی یەکەم ڕێزگرتن لە نەخۆش گرنگە، چونکە متمانەیەکی پتەو لەنێوان پزیشک و نەخۆشدا دروستدەکات و ئەمەش لە کۆی پرۆسەی چارەسەرکردنەکدا دەبێتە یارمەتیدەرێکی بەهێز. هەروەها گرنگیشە تێبگەین، کە نەخۆش وەک کائینێکی بێدەسەڵات و ڕووت و قووت دەچێتە بەردەستی پزیشک و لەو کاتەشدا پتر لە هەر ساتەوەختێکی تری ژیانی خۆی، هەستیار و ماندووە. نەخۆش نابێت لەوە زیاتر هەست بە بێدەسەڵاتی و ماندوویی خۆی بکات کە نەخۆشییەکەی دووچاری کردووە، چونکە ئەگەر بەتەواوی ئیرادەیمان تێکشکاند، چاککردنەوەی جەستەی مانای نابێت.

بۆیە دەتوانین بڵێین: لە پرۆسەی چارەسەرکردندا پەیوەندیی نێوان پزیشک و نەخۆش هەر تەنیا پەیوەندییەکی زمانی نییە، کە تیایدا بە وشە قسە لەگەڵ یەکتردا بکەن، بەڵکو ئاڵوگۆڕی نێوانیان پڕە لە نیگا و تەماشاکردن، پڕە لەجووڵە و دەستێوەدانی جەستەیی، تەوقەکردن و بەخشینەوەی خەندە و هتد. لێرەشەوە چارەسەرکردن بریتیە لە دروستکردنی ئەمجۆرە پەیوەندیانە لەگەڵ نەخۆشدا بەمەبەستی گونجاندنەوەی لەناو ژیانی کۆمەڵایەتیدا بە کەمترین زیانەوە.

لەهەموو ئەم قسانەوە تێدەگەین، کە پیشەی پزیشکیی و ئیشکردن لەگەڵ مرۆڤدا، بەتایبەتی ئەگەر ئەو مرۆڤە نەخۆش بێت، هەر تەنیا لە بواری پسپۆڕی و تایبەتمەندێتیدا

کورتناکرێتەوە. ئەوە بەس نییە پزیشکێک هەموو ساڵەکانی خوێندنی زانکۆ و ماوەی پراکتیکی و خوێندنی تایبەتمەندێتی لە بوارێکی جەستەی مرۆڤدا بە سەرکەوتوویی بڕیبێت و بڕوانامەیەکی بەدەستهێنابێت و دواجار بەیانیان لە نەخۆشخانەیەکی حکومیی و ئێوارانیش لە کلینیکەکەی خۆیدا چەندین نەخۆش ببینێت. مادام پیشەی پزیشکی ئیشکردنە لەگەڵ مرۆڤ و دەستخستنە ناو میکانیزمەکانی جەستەیە و گەلێک جاریش شکاندنی سنووری لەشی تایبەتیی نەخۆشە لە ڕێگەی نەشتەرگەرییەوە، ئەوە ئەم پیشەیە بەبێ تێگەیشتن و قووڵبوونەوە لە چەمکی مرۆڤ بەگشتی و لەبەرچاوگرتنی تایبەتمەندیی هەر تاکە مرۆڤێک بەتایبەتی، خۆی لەبەردەم مەترسیی گەورەدا دەبینێتەوە.

پیشەیەک کە تیایدا ڕێگە بدات بە پزیشک بچێتە ناو جەستەی تایبەتیی نەخۆشەوە و بێهۆشی بکات و پارچە لەکارکەوتووەکانی ببڕێت و پارچەی دیکەی تیادا شەتڵ بکا و هتد، ناتوانێت بەبێ تێگەیشتنێکی تایبەت لە مرۆڤ، خۆی لەو سیستەمە کۆنترۆڵکەرە دابڕ بکات کە پێیدەگوترێ: بەندیخانە و تیایدا بەندییەکان سزا دەدرێن و جەستە و کەسایەتیان دەشێوێنرێت. ڕەنگە پزیشکەکان پتر لەهەر کەسێکی دیکە پێویستیان بەوە هەبێت کە خاڵی جیاوازیی لە نێوان پیشە و هەڵسوکەوتی خۆیان و پیشە و هەڵسوکەوتی سزادەرەکانی بەندیخانەدا دروستبکەن، چونکە بەلایکەمەوە ئەو مرۆڤەی خۆی لە بەندیخانەدا دەبینێتەوە یەکێک لەو گریمانانەی دایدەنێت، مەرگ و نەمانی خۆیەتی. لەکاتێکدا سەرەتاییترین

گریمانەی نەخۆشێک، کە دەچێتە بەردەمی پزیشک، بریتیە لە خەونی ***چاکبوونەوە***.

ئێمە لە کولتوورێکدا دەژین کە لە قەبووڵکردنی هەموو دەستکەوتەکانی مۆدێرنیتەدا دوودڵ و نێگەتیڤ بووبێت، لە قەبووڵکردن و متمانەکردنیدا بە پیشەی پزیشکی و دەستی شفابەخشی پزیشکەکاندا دوو دڵ نەبووە. کولتووری ئێمە ئەوەندەی پەیوەندیی بە تەندروستی و پاکژیی جەستەییەوە هەبێت، کراوە بووە و لەمێژە شێوازە تەقلیدی و خورافییەکانی چارەسەرکردنی وەلاوە ناوە و ڕۆڵی حەکیم و جادووگەر و نووشتە و دۆعانووسەکانی کپکردۆتەوە و خۆی تەسلیمی دەستی شفابەخشی پزیشکەکان کردووە. ڕەنگە کەسایەتییەکی وەک مەحموود پاشای بابان لەمەدا دەستپێشخەر بووبێت، کاتێک ساڵی ١٨٢٠ بە ڕیچ دەڵێت با دەرمان بهێنن بۆ چاککردنەوەی کوڕەکەی، کە لەو کاتەدا تووشی ئاوڵە بووە!

هیچ توێژێکی کۆمەڵایەتی لە کولتووری ئێمەدا هێندەی پزیشکەکان نەبوونەتە درێژکراوەی ئیرادەی یەزدان کە لە خەیاڵگەی مرۆڤی ئێمەدا چارەسازی گشت دەردێک و شفابەخشی هەموو نەخۆشییەکە. وەلێ ئەگەر ئەمڕۆ سەرلەنوێ گەڕانەوەیەک بۆ خورافە و نوشتە و دۆعانووسی و شێوازەکانی چارەسازیی تەقلیدی دەبینین، ئەگەر دایکانی ئێمە حەزدەکەن لەماڵەوە و لەژێر دەستی مامانی گەڕەکدا منداڵیان ببێت و ئەگەر نەخۆشەکانی ئێمە زیاتر هەڵپەی چوونە تاران و ئەستەمبووڵیانە و ئەگەر دەردەرانی ناو کۆمەڵگەی ئێمە دەیانەوێ لە کونجی ژوورەوە بمرن و نەچنە لای پزیشک.. ئەوە بەمانای ئەوە نییە کە پیشەی پزیشکی باوی

نەماوە و دەستەوەستانە لەئاست چارەسەرکردنی کێشە جەستەییەکانی مرۆڤی ئێمەدا. بەڵکو هۆی هەرە سەرەکی بریتیە لە نەبوونی متمانە بە پزیشکەکان و ونبوونی دیدێکی مرۆڤدۆستانەیە لە پیشەی پزیشکی و سیستەمی تەندروستیی ئێمەدا. بێگومان هەروەکو لە سەرەتای، ئەم باسەیشەوە ئاماژەم پێدا، ئەمەش ڕەنگدانەوەی بارودۆخێکی سیاسیی تایبەتە و ناکرێت ڕەخنەگرتنمان لە سیستەمی تەندروستی دابڕبێت لە ڕەخنەمان لە کایەی سیاسی. لەم دۆخەشدا میدیاکان دەتوانن کاریگەربەخش بن و هەڵەی چارەسازیی پیشەکە، کە لە ڕێسا بەدەرە، وەک هەڵەی پزیشکی نەخەنە ڕوو و بیگشتێنن.. جیاوازیی هەیە لە نێوان ئەوەی تۆ چارەسەرەکەت جێی خۆی ناگرێت و دووچاری هەڵە دەبیت، لەگەڵ ئەوەی بە مەبەست ئەوکارە دەکەیت.

ئایا چی بکرێت بۆ ئەوەی جارێکی دیکە نەخۆش لە سیستەمی تەندروستی و لە ڕوانگەی پزیشکەکانەوە وەک مرۆڤێکی خاوەن گەورەیی و بەهای مرۆڤی تەماشای بکرێتەوە؟ چۆن ئاکاری پزیشکی لە سیستەمی تەندروستیماندا پراکتیزە بکەین و ڕۆڵی سۆسیۆلۆژیانەی دەزگا تەندروستی و پزیشکەکان لە کۆمەڵگەدا بەرجەستە بکەین؟ چۆن ڕێگە بگرین لەوەی کە ململانێی ناو پزیشکەکان نەبێتە بەشێک لە ململانێی نێوان پزیشک و نەخۆشەکان؟ هەموو ئەمانە پێویستیان بە وتاری دیکە و تێڕوانینی جیدیی هەیە بۆ ئەوەی بتوانین پەیوەندییەکانی ناو سیستەمی تەندروستی بکەینەوە پەیوەندیی مرۆیی و میهرەبانانە.. بە مانایەکی دیکە: دەبێت ڕۆڵی نەخۆشخانە و پزیشک و عیادەکانیان بخەینە بەرباس و

توێژینەوەی جیدی، پێویستە بە پزیشکەکان بڵێین: یەکەمین چارەسازی لە میهرەبانییەوە دەستپێدەکات، میهرەبانیی لەگەڵ تاکەکانی میللەتێکدا کە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی تەواو ماندوویان کردووە.. هەموو ئەمەش نەک لە پێناوی دادگاییکردنی پزیشک و سیستەمی ناوبراودا، بەڵکو لەبەرئەوەی کۆمەڵگە چاوەڕوانییەکی تایبەتی لە پزیشکەکان و پیشەکەیان هەیە..

من ئیتر کۆتایی بەم حەکایەتە دەهێنم، ئەگەرچی هیچم لەمەڕ زۆر شتەوە نەگوت، بۆ نمونە ئەو دوو دەمەقاڵەیەی لە نەخۆشخانە ڕوویاندا و بێگومان من تیایاندا دۆڕام. هیچم لەمەڕ ئەو قوتابیانەی تازە خوێندنیان تەواو کردووە و ئەو هەموو کێشەیەی لەگەڵ پزیشکە بەئەزموونەکاندا هەیانە نەگوت!؟ یان: ئەو هەموو ترسە چییە لە پزیشکە کۆنەکان هەیانە و ئایا دەکرێت لە سیستەمێکی تەندروستیدا ترس ئەکتەرەکان کۆبکاتەوە کە دۆخێکی ناتەندروستانەیە؟، یاخود بۆچی بەشێکی زۆر لەپزیشکە تازەکارەکانیش بەهەمان چاو تەماشای نەخۆشەکان دەکەن وەکئەوەی ئەوان تەنیا بابەتێک بن بۆ دیراسەکردن و لێوەفێربوون؟.. هەروەها تێنەگەیشتم بۆچی زۆربەی پزیشکەکان بەشێکی زۆری زانیارییەکانی ناو دۆسێی نەخۆشێک بە زمانی عەرەبی پڕ دەکەنەوە، ناوی ڕۆژەکانی هەفتە و لەناو خۆشیاندا کاتێک نامە دەگۆڕنەوە هەر بە زمانی شیرینی عەرەبی دەنووسن؟ من تێنەگەیشتم بۆچی کاتێک پیاوێکی بەتەمەن دەبەن بۆ ژووری نەشتەرگەریی بچووک، جامەدانەکەی لەسەر فڕێدەدەنە خوارەوە و لەو کاتەدا کە ئەو پیاوە پێویستی بە ئارامبوونەوە هەیە، زوویری

دەکەن؟ هەرگیز تێنەگەیشتم بۆچی ئەو پزیشکەی بڕیاربوو فەحسێکی تایبەت بۆ ژنێک بکات، بەسەریا هاوارییکرد: (کەی ئەمە کاتی عادەبوونە)؟ تێنەگەیشتم بۆچی بۆ وەرگرتنی پشتییەکی زیادە دەبوو دەستەوداماني بەرپرسی ڕایەخەکان بیت و ناچارت بکا لێی بپاڕێیتەوە و واسیتەیەک بکەیت؟ تێنەگەیشتم بۆچی دەرزی لێدەرەکە و ئەو کەسەی کانوولەکانی هەڵدەواسی، سۆندە و سرنجەکانی کۆدەکردنەوە و فڕێی نەدەدان؟ بۆچی کاتێک بۆنمکرد بە دژداشەیەکەوە، کە پەڵەیەک میزی پێوە بوو، کابرای بەرپرسی جلوبەرگەکان لێم تووڕە بوو؟

زۆرشت تێنەگەیشتم و ڕەنگە ئەمەش سیحری حەکایەتەکان بێت، کاتێک خۆیان نادەن بەدەست گێڕانەوەوە. یاخود ڕەنگە ئەمە دەسەڵاتی ئەزموون بێت کە ناهێڵێت هەرگیز ببێتە نووسین؟ دەشکرێ بڵێین: ئەمەش شکستێکی دیکەی نووسینە لەبەردەم ئەزموونێکی زیندوودا کە بە ڕۆح و جەستە پیایدا تێپەڕیوین و لەناو یادوەریدا تۆمار بووە.. وەلێ دەزانم هەموو ئەو شتانەی ئەزموونم کردن بەتەواوی مانا تەندروست نەبوون، هەموویان نیشانەی ئەو نەخۆشییەن کە سیستەمی تەندروستی ئێمە دووچاری بووە!

لەگەڵ ئەوەشدا بیرم ناچێت ئێمە میللەتێکی داگیرکراوین و ئەم داگیرکارییەش بە زۆر شێوە تا ئەم ساتەوەختە لە بەردەوامیدایە. فیلمی دۆبلاژکراو، لەولاوە بوەستێت، هاندانی خەڵک بۆ سەفەری پایتەختی ولاتانی داگیرکەر لەولای ترەوە بوەستێت، بەڵام خۆ نەدەبوو دەرمان و پزیشکیش بچێتە ڕیزی هەمان سیاسەتی ئەوانیترەوە. ئەمڕۆ ئێمە ناچارین دەمانی

ئەوانیتر بەکار بهێنن و زەینییەتی داگیرکاری پیشەی پزیشکی ئەوانیتری، بەجۆرێک لەلا پیرۆز کردووین، کە داهێنان و کارامەیی پزیشکە خۆماڵییەکان نەبینین. ئەمرۆ لە هەرێمی کوردستاندا بە رێژەیەکی زۆر باشترین ئامێرە پزیشکییەکانی دنیای تەکنەلۆژیا هەن، باشترین و سەرکەوتووترین نەشتەرگەری دڵ و مێشک لە وڵاتەکەدا دەگرێت. توێژینەوەی زۆر داهێنەرانەی پزیشکانی ئێمە لە باشترین گۆڤارە زانستییەکانی جیهاندا بڵاو دەکرێنەوە.. ساڵانە لەسەر هەر نەخۆشییەک و لە بوارە پسپۆرییە جیاوازەکانی زانستەکەدا، کۆنفرانسی جیهانی دەبەسرێت و بەڵام زەینییەتی داگیرکاری ئەمە نابینێت و شانازیی بەمەوە ناکات. ئەوەش بۆخۆی کێشەیەکی گەورەیە، کە ئەم زەینییەتە ئەوەندە خۆی تەسلیمی ئەویتر کردووە، کە پاشگەزبوونەوە مەحاڵە.. لەمەدا پێویستە پزیشکە بە ئەزموون و داهێنەرەکانی ئێمە نەکرێنە قوربانیی تەماعی بازرگانی و هێنانی پزیشکی دەرەکی لەسەر حسابی هەوڵی ئەوان.. پێویستە پزیشکە لێهاتووەکانی خۆمان بناسین، شانازییان پێوە بکەین و بیانکەینە سیمبوولی پیشەکە.. هەرچەندە لە دەستنیشانکردنی هەڵە و کەمتەرخەمی چارەسازی هەندێ پزیشک، چالاک بین، پێویستە لەوەش زیاتر سوور بین لە دەستنیشانکردنی پزیشکی خۆمان و زیرەکییەکەیان و رێزگرتنیان.. مرۆڤ دەبێت ئەوەندە بوێر بێت، کە حەقیقەت بڵێت، بەڵام هەڵە نەگشتێنێت..

٢٠٠٢

## پەراوێز و سەرچاوەکان:


١- Nudansk Ordbog: ٢, ١٢Udgave, s. ٩٢٧.

-Margrethe I. Kemp og P. Kemp: Et Liv der ikke dode. Spektrum, ١٩٩٧, s. ١١٨.

٢- Heine Andersen (red.) Sosiologi, en grundbog til et fag. Hans Reitzels Forlag. ١٩٨٨, s. ٢١٤.

٣- Margrethe og Kemp: op. s. ١١٨.

٤- Ibdi. s. ١١٩.


(*) ئەم نوسینە یەکەمجار لە ڕۆژنامەی برایەتی، هاوینی ٢٠٠٢, بڵاوکراوەتەوە و پاشان لە بەرگی یەکەمی کتێبی (نەتەوە و حەکایەت)دا, بڵاو کراوەتەوە.

# بەڵگەنامە

## بڵاوکراوەی مافە بنەڕەتییەکانی یەکێتی ئەوروپا

**ئەم بڵاوکراوەیە لە نۆڤێمبەری ساڵی ٢٠٠٢دا و لە ١٤ بەند دا بڕیاری لەسەر دراوە بەمجۆرەی خوارەوە:**

١. **مافی سوودمەندبوون لە پزیشکیی خۆپاراستن:** هەر کەسێک مافی هەیە سوودمەندبێت لە خزمەتگوزاریی گونجاو بە ئاراستەی خۆپاراستن لە نەخۆشی.

٢. **مافی سوودمەندبوون لە خزمەتگوزاریی بواری تەندروستیی و دەرمان:** هەر تاکەکەسێک مافی دەستڕاگەیشتوویی بە خزمەتگوزارییە ساخڵەمیی ودەرمانییە پێویستیەکانی خۆی هەیە. پێویستە خزمەتگوزارییە دەرمانیی و ساخڵەمیەکان لە بەردەست هەمووواندا بن بەبێ ئەوەی دەستێوەردان وجیاکردنەوە لەنێوانیاندا بە هۆکاری مادیی کەسەکان، شوێنی نیشتەجێبوونیان، جۆری نەخۆشییەکەیان، یاخود کاتیی سوودمەندبوونیان لەو خزمەتگوزاریانە بکرێت.

٣. **مافی سوودمەندبوون لە زانیاری:** هەرکەسێک مافی ئەوەی هەیە دەستی بە هەموو ئەو زانیاریانە بگات کە پەیوەندییان بە نەخۆشییەکەیەوە، خزمەتگوزاریی تەندروستیی و چوێنێتی سوودوەرگرتن لێیان و گشت

ئەو خزمەتگوزاریانەی بەهۆی توێژینەوەی زانستی و نوێکردنەوەی توکنەلۆژییەوە بەدەست دێن، هەیە.

٤. **مافی ڕەزامەندیی دەربڕین:** هەر کەسێک مافی ئەوەی هەیە دەستی بەو زانیاریانە بگات کە توانای بڕیاردانی بۆ بەشداریکردن لە بڕیاردان سەبارەت بە سەلامەتیی خۆی دەدەنێ.

٥. **مافی هەڵبژاردن:** هەر کەسێک مافی ئەوەی هەیە لە نێو شێوەدەرمانیە جیاوازەکان و شوێنەکانی چارەسەرکردندا، بەپێی زانیاریی پێویست، یەکێکیان هەڵبژێرێت.

٦. **مافی پاراستنی زانیاریی تایبەت و پاراستنی پێگەی کەسیی:** هەرکەسێک مافی ئەوەی هەیە زانیارییە کەسییەکانی خۆی بپارێزێ، لەوانەش ئەو زانیاریانەی پەیوەستن بە بارودۆخیی تەندروستیی و قۆناغەکانی دەستنیشانکردن، دەرمانکردن و چارەسازییەوە. هەروەها مافی ئەوەشی هەیە کە بینەری پارێزگاریکردنی حەریمی کەسییەکەی لە میانەی پشکنیندا، چاودێریکەری پزیشک و بە شێوەیەکی گشتی چاودێریکەری دەرمان و پزیشکیی و نەشتەرگەریی بێت.

٧. **بەهابەخشین بە کاتی نەخۆشەکان:** هەر کەسێک مافی ئەوەی هەیە کە لەو ماوەیەدا پێشتر بۆ دەرمانکردنی دەستنیشان کراوە، لە خێراترین کاتدا سوودمەند بێت لە خزمەتگوزارییەکان.

٨. **مافی سوودمەندبوون لە ستانداردە جۆرییەکان:** هەر کەسێک مافی سوودمەندبوونی لە خزمەتگوزاریە تەندروستییە نەوعییەکان بەپێی ستانداردە دەستنیشانکراوەکان، هەیە.

٩. **مافی پاراستن و ئاسایش لەبەرامبەر مەترسیی و هەڵەکان لە کاتی دەرمانکردندا:** هەرکەس مافی ئەوەی هەیە بەدوور بێت لەو زیانانەی لە ئەنجامی کەمتەرخەمیکردن لە خزمەتگوزارییە تەندروستییەکان و هەڵەکانی چارەسازییەوە سەرچاوە دەگرن و مافی هەیە دەستی بەو خزمەتگوزارییە دەرمانیی و پزیشکیانە بگات کە بەپێی ستانداردە باڵاکانی خۆپارێزیی دەستنیشان کراون.

١٠. **مافی سوودمەندبوون لە داهێنانەکان و نوێکردنەوەی بواری تەندروستیی و دەرمان:** هەرکەسێک مافی ئەوەی هەیە سوودمەند بێت لە پرۆسەکانی داهێنان، کە شێوازیی دەستنیشانکردن و پشکنین بەپێی ستانداردە نێونەتەوەیی و بەبێ لەبەرچاوگرتنی لایەنی ئابووری و مادیی، دەگرێتەوە.

١١. **مافی پاراستن لە ئازار و دەردیی نا پێویست:** هەرکەس مافی ئەوەی هەیە سوودمەند بێت لە ئاسوودەیی و لە بواری خزکەتگوزاریە تەندروستیەکاندا تا ئاستی شیاو، بۆ ئەوەی لە قۆناغی نەخۆشییەکەیدا بەدوور بێت لە ئازار و دەرد.

١٢. **مافی دەستڕاگەیشتن بە دەرمان بەپێی تایبەتمەندییە کەسییەکان:** هەر کەسێک مافی ئەوەی هەیە، سوود

لەو بەرنامانەی پشکنین، یان دەرمانانە وەربگرێت کە تا ئەندازەیەک لەگەڵ دۆخیی کەسییانەی ئەودا دەگونجێن.

١٣. **مافی شکاتکردن:** ئەم مافە بۆ هەموو ئەو کەسانە پارێزراوە کە لە دۆخی زیانپێگەیشتوویی و زەرەردا پەنا بۆ شکاتکردن دەبات و پێویستیشە ئەنجامەکەی لە کاتی خۆیدا بەدەست بگات.

١٤. **ماربووکردنەوەی زیان:** هەرکەسێک ئەو مافەی هەیە لە ماوەیەکی تایبەتدا، ئەگەر زیانی جەستەیی، ئەخلاقیی، یان ڕۆحیی، لە ئەنجامی دەرمان وەرگرتنەوە پێگەیشت، خوازیاری ماربووکردنەوەی زیانەکەی بێت.

**سەرچاوە: آندرولاالفتریو؛ (TIF). فدراسیون بین المللي تالاسمی، ت: مهدی تبریزی، تهران : مؤسسه انتشارات نزهت، ١٣٨٦ (٢٠٠٧)، ل: ٤٠-٤٢.**

# خلاصة البحث

## الإستطابة (Patientology) والأخلاق الطبية

### خلاصة حول حقوق المريض من منظور فلسفي في ضوء العلاقة بين الفلسفة والطب

تتناول هذه الدراسة بالبحث والرصد طبيعة العلاقة الإشكالية بين الأخلاق الطبية و الإستطابة (الطب فنا وعلما) مؤكدا على أن هذه العلاقة لم تكن مستقلة في أي وقت من الأوقات.
ومن هذا المنظور يلاحظ أن الأخلاق الطبية لم تكن منعزلة عن حقوق المرضى وبالتالي عن فن الطبابة ( مهنة ونظرية), بل كانت تتشكل معا كلا واحدا في سياق تطور علم الطب حتى وقتنا الراهن.
الدراسة التاريخية التطورية تقع في صلب رؤية هذا البحث للعلاقة الصميمية بين علم الطب (نظرية وممارسة) والفلسفة كعلم شامل بقضايا الوجود والإنسان, ليخلص في المآل إلى إثبات استحالة الفصل بينهما على صعيد الممارسة والنظرية. ومن ثم التأكيد على ضرورة هذه العلاقة راهنا ومستقبلا على مستوى فلسفة الأخلاق والطب.

تتجلى تلك العلاقة أيضا عبر ملاحظة التوازي في التطور والإتساق بين الفهم الفلسفي للإنسان وتقدم علم الطب. وينعكس هذا الإتساق على صعيد الممارسة (الطب كمهنة)

الخلاصة تنحاز الدراسة إلى على جدوى تصدي الفلسفة للقضايا الأخلاقية والاجتماعية العملية, من موقع التأكيد على وحدة المعرفة الإنسانية وعودة العلوم الجزئية على الدوام إلى مرجعيتها القيمية الفلسفية.

## سەرچاوەکان بەپێی بەکارهێنانیان:

- دیوید سی. لیندبرگ: سراغازهای علم در غرب (سنت علمی اوروپایی در بافت فلسفی، دینی و تأسیساتی ان: ٦٠٠سال قبل از میلاد تا ١٤٥٠ میلادی). ت: دکتر فریدون بدرەای، شرکت انتشارات علمی و فرهنگی، تهران، ١٣٧٧ (١٩٩٨).
- هنریک ر. ولف، استیگ اندرپدرسون، ریبن روزنبرگ: درامدی بر فلسفهء طب. ت: همایون مظلحی. تهران، طرح نو، ١٣٨٠ (٢٠٠١).
- آندرولاالفتریو؛ (TIF). فدراسیون بین المللي تالاسمی، ت: مهدی تبریزی، تهران : مؤسسه انتشارات نزهت، ١٣٨٦ (٢٠٠٧).
- رێبوار سیوەیلی: نەتەوەو حەکایەت، ب: یەکەم، چ: دووەم، دەزگای موکریانی: **(چارەسەرکردن لە نێوان پسپۆڕیی و میهرەبانیدا)**، لل: ٣٧٩-٣٩٥، ٢٠٠٨.
- رێبوار سیوەیلی: فەلسەفەی پێشسوکرات، لە تالیسەوە تا دیموکریتۆس، بەرگی یەکەم، دەزگای زەریاب، ٢٠١٢.
- دکتر منوچهر محسنی: جامعەشناسی پزیشکی. تهران، انتشارات طهوری، چ: هفتم، ١٣٨٢ (٢٠٠٣).

- مسعود امید، بهزاد حسن پور: فرهنگ اصطلاحات فلسفی کانط. تهران: نشر علم، ١٣٩١ (٢٠١٢).
- حسین شیخ رضایی، امیر حسن کربسی زاده (ویراستاران): علم، جامعه، أخلاق (جستارهای در ابعاد اجتماعی و أخلاقی علم). تهران: انتشارات مینوی خرد، ١٣٩١ (٢٠١٢).
- جیمز ریچلز: فلسفه اخلاق. ت: ارش اخگری، تهران، مؤسسه انتشارات حکمت، ١٣٨٩، (٢٠١٠).
- بیئاته لؤڤه شلی دال (سەرپەرشتیار): کورتەباسێک سەبارەت بە مافەکانی مرۆڤ. و. ئیبراهیم ساڵحی راد، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١١.
- د. مهدی محقق: (تألیف و ترجمه): مجموعهء متون و مقالات در تاریخ و اخلاق پزشکی در اسلام و ایران. تهران، سروش، ١٣٧٤، (١٩٩٥).
- جورج سارتن: تأریخ علم، ١، از هومر تا عمر خیام، ت: غلامحسین صدری أفشار، تهران: انتشارات علمی و فرهنگی، ١٣٨٨، (٢٠٠٩).
- کالین أ. رنان: تاریخ علم کمبریج. ت: حسن افشار، تهران: مرکز، ١٣٨٢ (٢٠٠٣).
- حکمت نجیب عبدالرحمن: دراسات فی تأریخ العلوم عند العرب. جامعه موصل، ١٩٧٧.
- د. اردشیر خدادادیان: ٢، تاریخ یونان باستان، تهران: انتشارات سخن، ١٣٨٥ (٢٠٠٦).
- Johannes Fabricus: Oldtidens Idehistorie. Gyldendals Ugleboger, ١٩٦٥.

- تئودور گمپرتس: متفکران یونانی، جلد اول، ت: محمد حسن لطفی، تهران: شرکت انتشارات خوارزمی، ۱۳۷٥ (۱۹۹٦).
- Kadri Yildirim: Tiba Melaye Erwasi. Wesanen Enstuituya Zimanen Zindi ya Zaningeha Artuklu ya Merdine. Capa Yekem: ٢٠١٢.
- ورنر یگر: پایدیا: جلد ۲، ت: محمد حسن لطفی، تهران: شرکت انتشارات خوارزمی، ۱۳۷٦ (۱۹۹۷).
- Birkler, Jacob (٢٠٠٦) *Videnskabsteori – en grundbog,* København, Forlaget Munksgaard.
- Bisgaard, Niels J. og Rasmussen. J. (٢٠٠٦) (red.) ٤. udgave, *Pædagogiske teorier,* Værløse, Forlaget Billesø og Baltzer
- Frederiksen, Kirsten (red.) (٢٠٠٥) *Perspektiver på faglighed,* Århus, Udviklingsinitiativet for Sygeplejerskeuddannelsen i Århus Amt
- Fuglsang, Lars og Olsen Poul B. (red.) (٢٠٠٤) *Videnskabsteori – På tværs af fagkulturer og paradigmer,* Frederiksberg C, Roskilde Universitetsforlag.
- Pedersen, Søren (red.) (٢٠٠٧) *Sygeplejebogen* ١, ١. *del,* Gads forlag.
- -Margrethe I. Kemp og P. Kemp: Et Liv der ikke dor. Spektrum, ١٩٩٧

- ٢- Heine Andersen (red.) Sosiologi, en grundbog til et fag. Hans Reitzels Forlag. ١٩٨٨

گۆڤارەکان:

- Andersen, Ole Dibbern (٢٠٠٤) *Problembaseret læring – En anden måde at tænke uddannelse på,* http://www.delud.dk/dk/publikationer/PBL/index.html
- Tidsskriftet Grus ٥٢/١٩٩٧, Timm, Helle, *At have en krop og være en krop.*
- Tidsskriftet Sygeplejersken ٢٠٠٨/١, Eriksen, T. R. m.fl., *Sygeplejestuderendes omsorgsforudsætninger ved studiestart i ٢٠٠٢*
- Tidsskriftet Sygeplejersken ٢٠٠٨/١٧, Eriksen, T. R. m.fl., *Undervisning i sygepleje i Klasserummet*
- Tidsskriftet Uddannelse ٢٠٠٣/١, Hermann, Stefan, *Fra styring til ledelse,* Undervisningsministeriet
- Tidsskriftet Uddannelsesnyt ٢٠٠٥/١, Madsen, Kirsten Halskov, *Patientologi – Læren om det at være patient.*

فەرهەنگەکان:

- *Thomas Mautner: The Penguin Dictionary of Philosophy, ٢end edition. Penguin Books, ٢٠٠٥.*
- *أندريه لالاند: موسوعه لالاند الفلسفيه (معجم مصطلحات الفلسفه النقديه و التقنيه، المجلد الاول، ت: خليل أحمد خليل، بيروت: عويدات للنشر و الطباعه، ٢٠٠٨.*

*نامەی زانستی:*

- Annette Dippel Larsen Patientologi – Et redskab for kompetenceudvikling : Aalborg Universitet. Institut for Læring og Filosofi
- Laila Pertou Ringkøbing: At være patient i vor tid. En undersøgelse af patienters oplevelse af at være patient, set i et eksistentielt, samfundsmæssigt og sygeplejefagligt perspektiv. AAHUS Universitet, ٢٠٠٤.